شیعر

# ژیان بەدرۆوە جوانە

عومەر سەیدە

- ژیان بە درۆوە جوانە
- شیعر
- عومەر سەیدە
- ٢٠٠٦
- ٥٠٠ دانە
- ژمارە سپاردنی(      )ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

ژیان جوان نیە کە تۆ بڕۆی
گەرچی ڕۆیشتنەکانی تۆ دڕۆن .. هاوڕێ
دەمەوێ ئەم شیعرەت پێشکەش بکەم
بە تۆ ..
کە پێم ووتی:
پێشکەشە .. بە تۆ
هەرچەندە بەر لەوەی بینووسم
زانیم کە تۆ لێرە نابی ..
بەڵام
هەر پێشکەشە .. بە تۆ





ڕەشەباکانی ئێرە فێرن
بە ستونی دارتێلی کۆلانەکان شمشاڵ بژەنن
فێرن بەبێ پرسی باخچە گوڵەکان بدزن
فێرن هەرچی گەردی حەوشەکەمان هەیە
بیبەن لە یەخەی
شووشەی پەنجەرەی ژوورەکەم ..
منیش فێرم نەفرەت لە ڕەشەباکان بکەم
فێرم بەبێ پرس بۆ پرسەی خۆم بگریم و
فێرم هەرچی جوانیم هەیە لە بەیانییەکدا وون بکەم
کە کوکوختییەکان تیایدا گۆرانییەک بۆ ڕەشەبا ناخوێنن ..
ئەوە من و ئەوە ڕەشەبا

ئەوە من و ئەوە مەرگی گوڵە دزراوەکانی باخچە
کام وێنەکێش
لە تابلۆیەکی لارو خواردا جێمان دەکاتەوە!!
ئەوە من و ئەوە هەرچیم هەیە
ئەوە ڕەشەباو ئەوە هەرچی هەیە ..
باڵندەکان لێرە فێرن
ئێواران بۆ هێلانەیەک بگەڕێن کە هی ئەوان نیە
فێرن لە ئێوارەدا بەرەو غروب لە باڵ بدەن و
کەسیش نەزانێت چ لوغزێک لەو فڕینەدایە ..
فێرن تەنها لە دڵتەنگی قەفەسێکدا گۆرانی ژیان بچڕن
فێرن هەمیشە گلەیی لە خودا بکەن



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

کە چارەنووسیان وا لە تەنیشت حەزی ڕاوچییەکان ..
ئەوە من و ئەوە باڵندە
ئەوە من و ئەوە دیلێتی پەڕندەکان
کێ عەقڵ دەبەشێتەوە ؟!
با خاڵی ناکۆکی نێوانمان دیاری بکات
شەقامەکان لێرە فێرن
لەگەڵ هۆڕێنی ماشێنەکان و
لەگەڵ کەڕەنای جەنگە نادیارەکاندا
جەرگیان لەت .. لەت بکەن ..
شەقامەکان لێرە فێرن
خوێنی ئێمە ..

وەکو گوڵ .. لە یەخەی بەیانیەکان بڕەن و
لەگەڵ سرووری مەرگدا
ئاڵای ڕندەیی بەرز بکەنەوە ..
ئەوە من و ئەوە شەقام
ئەوە من و ئەوە هەرچی شک دەبەم
لەم نیشتمانە خوێناوییە ..
کێ دەتوانێ لە سەمای لای ئێوارنی شۆڕە بییەکان
حەرفێک بۆ جوانی هەناسەدان بیبنێتەوە ..
کێ لە حیکمەتی گریانەکانی دار قەیسییەک تێدەگات
کە هەموو بەیانییەک گەڵاکانی دەکاتە قوربانی ..
کێ دەزانێ ئەو هەرایانە کۆ بکاتەوە





کە هەترەشی ئەستێرەکان دەبەن ..
هەمیشە لەگەڵ دوو قوم جگەرەدا
حەسرەتی ناکامی چارەنووسی دەریاکان دەدەن بە(با) ..
لێرە .. ئێمە فێرین
نەورەسەکان بتۆرێنین بۆ ئەوەی عیشق نەمێنێ
لە کەناری دەریاکانی کەناری شاردا ..
ئێمە فێرین
بەر لە مردن بۆ پرسەی خۆمان
چەپکێ گوڵ ببەینە سەر گڵکۆی ویژدان و
لەگەڵ درۆدا بیر لە هاتنی شەو بکەینەوە
ئێمە فێرین هەناسە نەدەین بەبێ پرس ..

ئەوە ئێمەو ئەوە جەهالەتی ژیان
ئەوە ئێمەو ئەوە هەرچی حەزە
ئەوە ئێمەو ئەوە گۆڕستانەکان و
ناونیشانی سەر گۆڕەکان
کەسمان پاڵەوان نەبووین و نابین
کەسمان مەزن نەبووین و نابین
کەسمان ڕەمزێک نین بۆ مەعریفە
کەسمان هیچ لەو دەرویشانە تێناگەین
کە دەفەکەیان دەدەنەوە مورشیدەکەیان و
بە پەنجەی پێیان خەتی ئەڵقەی زیکریان دەسڕنەوەو
پرچەکانیان لە بەیانیەکدا دەقرتێنن و





ڕوو لە هیچ کوێ دەڕۆن ..
دەڕۆن و سکالاو گلەییان دەبەنەوە بۆ عەدەم ..
تۆ دەڕۆیت و جێمان دەهێڵی هەموو ڕۆژێک
ئێمە ئیدی باسی چی بکەین ..
ئەمە حیکایەتی ڕۆشتنەکانی ئێرە نیە
تۆ دەباتەوە بۆ کەنارەکانی عەدەم ..
ئەمە چیرۆکی خەزەڵ و ڕەشەبا نیە
هەموو ڕۆژێ تۆمان دەباتەوە بۆ ئەوێندەر..
ئەو دار هەنارەی بەشی زەمیلەیەک هەنار ناگرێت
دەتوانێ سێبەرێک بێت بۆ ژوانەکانمان ..
ئەو چۆلەکەیەی ئەمڕۆ لە حەوشەکەدا چینە دەکات

سبەی بەرەڵاستیکی مناڵێك دەیکوژێت ..
ئێمە ئاوها شەق لەو بەرە هەڵدەدەین
کە وادەزانین ژیان لە بن هەنگڵیدایە ..
ئێمە ئاوها باخچەکان ئاو دەدەین
کە ئاو نادەینە مناڵێکی تینووی سەرشەقامەکان ..
ئەمە بەشێك نیە
لە ڕۆمانەکانی سەدەی تاریکی ..
ئەمە شیعری ڕۆژانی نەبوونی عەقڵ نیە ..
ئەمە ئەمڕۆیە
کە من دەمەوێ شیعرێك بنووسم و
ئێوە گوێی لێ ناگرن ..





من دەمەوێ بە ڕۆژی نیوەڕۆ
خۆم ڕووت ڕووت بکەمەوەو
بە شەقامەکاندا بگەڕێم
لە داخی ئێوە .. کامێرایەك بهێنم و
دوو ڕەسمی ڕووتی شێتترین کچی ئەم شارە بگرم
دەستی یەك بگرین بۆ زەماوەندی مردنی هەردوکمان
..
دەمەوێ فوو بکەمە کەڕەنایەکەوە
تا لە ئافاتی جەهل ڕزگارتان بکات ..
دەمەوێ ئەم شیعرەم
وەکو پاکنووسی چیرۆکەکەی(زاهیدی)* بدڕێنم

دەترسم پێم نەڵێن شێتە ..
تۆ بۆ دەڕۆی ؟
کە دەزانی ئێمە هیچمان پێ نەماوە بۆ ووتن ..
بگەڕێوە باسی ئەو شەقامە بکە
کە لە ئێمە ناچێت پەیکەرەکانی ئەو ..
باسی ئەو مرۆڤانە بکە کە نایانەوێ بژین ..
باسی ئەو ئاینە بکە
کە ئەفیونی کردووین بەرەو مردن ..
بگەڕێوە ..
لەوە زیاتر ماتەڵمان مەکە .. ئەی تۆ
زمانی بە هەڵوەرین بچێ ..



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

ئەوەی پێی ووتی: دوایین هەناسەت بەرەو مەگەڕێوە ..
کەسێك نایات ئەم شیعرەم لێوەرگرێت و بیدرێنێت
پێرەچێ تێنەگەن چی دەڵێم ..
شکانی تەلیسمی کۆمەڵگێکە دوایین دێڕی ئەم شیعرە
تەقە تەقی دەرگایەکە .. کە کەس نایکاتەوە
باران بە خوڕ دێتە خوارێ و کەس دەرگاکە ناکاتەوە ..
خێراکە بگەڕێوە ..
با مرۆڤەکانی ئەم هۆڵەش نەمرن لەخەوتندا
وەرەو ئەم دەقە سواوەی نێو دەستم لەت .. لەت بکە

مەهێڵە دوایین دێڕی بخوێنمەوە ..
ئەوان تێناگەن ..
تێناگەن کە من دەمەوێ چی بکەم
ئەوان گوێ دەگرن ..
گوێ دەگرن لەو حەرفانەی کە هیچی لێ تێناگەن ..
ئەگەر هەر نایەیتەوە
ئەمڕۆ سبەی پەیامێکمان بۆ بنێرە
تا بزانین هەفتەی داهاتوو کێ قسەمان بۆ دەکات
بۆ ئەوەی پێڵاوی زۆر بهێنین تا بیدەین بە دەمیا
ئەگەر وەکو درۆزن بوو ..
ئەگەر وڕێنەکانی لە قسەکانی تۆ نەچوون ..





ئەگەر کەس لێی تێنەگەیشت ..
ئەگەر شێتی تەواو نەبوو ..
بەشی دوو زرتی درێژ فوومان بۆ بنێرە
تا لە پاش هەموو وتارەکان بیکێشن
تاقەتی فیکەو چەپڵەمان نەماوە ..
چەند حەسرەتە چەپڵەڕێزان کە نەزانین چی دەوترێ ..
کە نەزانین چیمان پێدەڵێن ..
"خێراکەو ئەو خەنجەرە بهێنە کە من پێی دەمرم"
مردن کەسمان نادۆزێتەوە
کە ئەوەندە گەمژانە بیر لە ژیان بکەینەوە ..
تۆ وادەزانی حەرفەکانی تۆمان بۆ دەخوێنرێتەوە ..!!

نا .. ئازیز تۆ زۆر لەوە گێلتری کە منیش دەیزانم
وامەزانە ئێمە چاومان هەیە ..
تۆ وادەزانی ئێمە هاوارەکانی تۆ دەبیستین ..!!
نا هاوڕێ .. تۆ زۆر لەوە بێرەنگتری کە ئێمە
دەیبیستین
وامەزانە ئێمە گوێمان هەیە ..
تۆ وادەزانی ئێمە تابلۆکانی تۆ دەبینین ..!!
نا ئەفسوس .. تۆ زۆر لەوە بێڕەنگتری
کە ئێمە تەفسیری یەک پنتی ڕەنگی تۆ بکەین ..
وامەزانە ئێمە دەممان هەیە ..
نە دەبینین ..





نەدەبیستین ..
نەدەڵێین ..
ئێمە لە کوانووی ئەو خێڵە جێماوین
کە ئاڵایەکی هەیە بۆ فەشەل ..
خاکێکی هەیە بۆ دزین ..
جوگرافیایەکی هەیە
لە نەخشەی دەستی منداڵ دەچێت ..
لەشکرێکی هەیە بەر لە چوونە جەنگ دەدۆڕێت ..
سەرۆکێکی هەیە بەر لەوەی حوکمڕانی بکات
تەختی و بەختی دەڕوخێت ..
ئەی تۆ .. ئەی شێتتر لە من

ئەی گێلتر لە هەمومان ..
ئەی نەفامتر لەو منالەی دەگری
بەدەستی کۆلارەیەکی تەقڵەبازەوە ..
ئەمڕۆ ڕۆژی مردنی ئێمەیە
کەسێک نیە فاتیحای ئیلحادیمان لەسەر بخوێنێ ..
ئەمڕۆ ڕۆژی هەڵڕشتنی درۆیە
کەسێک نیە درۆکان کۆبکاتەوە ..
کەسێک نیە ڕاستی بزانێت ..
هەمووشمان هەقیقەتمان لێوە دیارە ..
بەڵام هێشتا بە زوڕناکەی ئەو هەڵدەپەڕین
ئەو کەئێمەی خۆش ناوێ ..





ئەو کە ڕقی لە خۆیشی دەبێتەوە
کاتێ لەسەر کورسیەکەی هەڵدەستێ ..
ئەو کە قوربانیەکان دەکاتە وەرەقەی
قوماری سەر مێزی ئەمڕۆ
خوێنی زیندووەکانیشی پێوە دەدۆڕێنێ ..
ئەو تەنیا نیە .. ئەوانن
"ئەوان کورسیان خۆشتر دەوێ تا نیشتمان
کورسیان خۆشتر دەوێ تا وڵات
کورسیان خۆشتر دەوێ تا خەبات
کورسیان خۆشتر دەوێ تا پەلکی جوانی کچێک"
کورسیەکانیان هەمیشە لەنگ و خوارن ..

بۆیە تۆ وەرەوە .. تۆ
ئێمە نازانین روو لە کام رووگە بکەین ..
هەمووی بووە بەسەرچاوەی خوێن ..
نازانین لە کام بڵندگۆوە
بانگی دوایین تەراتیلی بەرەو مردن بدەین ..
بڵندگۆکان دەنگیان دانوساوەو هیچ ناڵێن ..
ئەو هەورەی بەسەرمانا دادەکات
باسی نەزاهەتی تنۆکە بارانەکان نازانێ ..
ئەو گولاڵەی شەونمیان لە ئامێز ناوە
سۆزی جوتبوونی نیوەشەوان نازانن ..
ئەو بووکە شوشانەی دەسماڵیان لە کۆڵە



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

مۆنۆمێنتی کچۆڵە ئەنفالکراوەکانی گەرمیانە و
لە بازاڕەکاندا دەفرۆشرێت ..
ئەو جامانەیەی کە بە خوێن بۆیە کراوە
درۆی جوانی شەهیدبوونە لای درۆزنەکان ..
ئەو بیابانەی دڵی ئێمەی بردوە ..
دڵی ئێمەی هەپرون .. هەپرون کردوە
دڵی ئێمەی لە خۆیدا شاردووەتەوە
ئەوە شوێنەزای جوانترین باوەڕی
گێلترین بەندەکانی خوایە ..
ئەو کلاورۆژنەیەی هیچ تیشکێک لێوەی گوزەر ناکات ..
هیچ گەردێک لێوەی نایاتە ژووری ..

هیچ کچێک لێوەی سەر دەرناهێنێ ..
هیچ بەردێک شوشەکانی ناشکێنێ
ئەوە کلاوڕۆژنەی دڵی عاشقی منە ..
ئێوە چی دەزانن لە درۆکانی من
کە هەموو ڕۆژێ بۆتانی دەکەم ..
ئێوە چی دەزانن لە درۆکانی ئەوان
کە هەموو شۆڕشێ دەیلێنەوەو
شاخەکان بە شوو دەدەن ..
چی دەزانن لە حیکایەتی ئەسپە سەرکێشەکانی شیعر و
سوارچاکە شێتەکانی شیعر ..؟
بۆ هیچ ناڵێن خۆ من شیعرتان بۆ ناڵێم ..





من برینتان نوێ دەکەمەوە ..
ئەمە بڕوای ئەو سوڵتانانەیە ..
کە وەکو خوداو ئەفلاتۆن
شاعیریان کردووەتەوە دەرەوەی خۆیان ..
شاعیریان پێ داوەتە بەر شەق و
شیعرەکانی دەسوتێنن ..
دێڕەکانی لە خاچ دەدەن .. !!
هەناسەیەک بدەو .. وەرەوە تۆ
لە سوچێکی ئەو هۆڵەوە لەو وێنانە بڕوانە
کە ناگیرێن ..
لەو مرۆڤانە بڕوانە کە دەگریین ..

لە من و وشە تێکەڵ و پێکەڵەکانم بڕوانە ..
دەبینی لە دووت دەگەڕێم ..
تۆ بەر لەوەی بڕۆی هاتیەوە و وتت: ماڵئاوا
بەر لەوەی بمریت
وتت: دەمرم بۆ ژیان
مردی بۆ ژیان و ..
ژیان ئاوڕێکیشی لێ نەدایتەوە ..
وتت: دەژێمەوە بۆ ژیان ..
نەژیایتەوەو ژیان هەر پرچی شانە دەکات ..
ژیان هەر وا بەڕێی قوتابخانەوە پێڵاو دەدڕێنێ ..
جانتا کۆن دەکات ..



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

چاوبڕکێ لەگەڵ ئاسماندا دەکات و
هەموو کوڕە عاشقەکانی دیکەش
وەکو تۆ دەکوژێ و
قاقا لێرەدا بە گەمژەیی ئێوە ..
بگەڕێوە .. گەر مردن خۆش نیە بگەڕێوە
گەر بەهەشت خۆش نیە بگەڕێوە
گەر بەبێ ئێمە دۆزەخیش خۆشە مەگەڕێوە
گەر بەبێ ئێمە
چاوەکانت لە فرمێسك ووشك دەبن .. مەگەڕێوە
چی دەکەیت .. بکە
"تۆ ئازادی لە قەفەسی چاوانم

بەڵام قەفەسی دڵ خۆت دەرگاوانیت"
ئەم وەرزە .. وەرزی خەندە نەبوو
وەرزی گریانیش نیە ..
وەرزی گەڕانە لە رووی مەرگ
هاکەمەرگ هات و بردینی
هاکە ئیدی هەناسە نامێنێ ..
لەم وەرزەدا پێکەوە سەفەرێ بەرەو مەرگ
پێکەوە مەرگێ بەرەو عەدەم
پێکەوە درۆیەک کە چیا ئامێزمان بۆ دەکاتەوە ..
پێکەوە هەموو شتێک بەڵام هەقیقەت .. نا
پێکەوە هەموو فێڵێک .. بەڵام هەقیقەت .. نا





پێکەوە هەموو زەندیقیەک .. بەڵام هەقیقەت .. نا ..
نا
وەرن با زووتر بگەینە دوایین دێڕی ئەم شیعرە ..
با زووتر بمرین ..
با زووتر ئەم خەڵوەتە بکێشین
کە بە دڵنیاییەوە هەموومان دەکوژێ
کە بەدڵنیاییەوە هەموومان خەجاڵەت دەکات ..
با زووتر بگەینە لوتکەی خەجاڵەتی ..
ئێمە شەریکی درۆکانی ئەوانین
ئێمە جەللادی کوشتنەکانی ئەوانین
ئێمە ئاخوندەی گوتارەکانی ئەوانین ..

ئەوان لەمێژە مردوون و زیندوو نابنەوە ..
ئەوان سالانێکە جوانییان سەفەری کردووەو ناگەڕێتەوە
..
ئەوان نایەنەوە ..
ئێمەین ئاگرەکە جۆش دەدەین ..
ئێمەین ئەو خاکسارەی
بەشی پێکردنی جگەرەیەک پشکۆمان تیا نیەو
بۆ پڕ ورشەکردنی درۆکانی ئەوان
بووینە بە ژیلەمۆ ..
ئێمەین .. قینمان لە خۆمانە و
کەسمان تەفسیری ئەم گێلێتیە نازانین



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

کە خەریکە دەمانکات بە ئەهریمەن ..
خەریکە وەکو سوپای سوڵتانە جاهیلەکان
جارێکی دی ..
فەتوای پژانی مێشکی زەردەشتیەکان دەکارین ..
وەرن لەم مینبەرەوە
بڕواننە درۆکانی سوڵتان
وەرن لەم وێستگەی درۆکردنەوە
دەمراستی درۆزنەکان بکەین ..
وەرن گەر بەشی دەقێک خەیاڵتان تیایە ..
وەرن گەر یەک وشە راستی دەزانن ..
وەرن گەر لەدڵیشەوە راستی دەڵێن ..

مەیەن ..
مەیەن گەر وەکو دوێنێ
پەنجەتان ئاخنیوتە گوێیەکانتان
گەر وەکو پێرێ
تەرمەکانتان بەدارەوە ماوە .. مەیەن
گەر وەکو ئێستاش
بێرەنگ .. بێرەنگ دادەنیشن .. هەر مەیەن
کێ چاوەڕێی ئێوە دەکات ..
کێ گوێ لە ئێوە دەگرێ ..
کێ دەزانێ ئێوە هەن ..
کێ دەیەوێ بزانێت ئێوە چین ..





کێ .. کێ
کێ دەهۆڵی ئەم هۆشیارییەتان بۆ دەکوتێ ..؟
زوڕنای ئەم نەزانینەتان بۆ دەژەنێ ..
ئێستا دەمی بەزم و ڕەزمە ..
دەمی لەیەک دانی بادە ئاڵەکانە ..
دەمی فڕکردنی ئەو بادە ژەهرەیە
لە گیانکێشەکە دایە(سیزیف)
دەمی لەکۆڵ نانی بەردەکەیە ..
دەمی هیچ نیە .. هیچ
"چیم داوە لەو قامیشەڵانەی
قامیشێکی ڕەنگ زەردی

عاشقی خۆی لێی یاخی دەبێ"
کە من نەزانم شمشاڵێک بژەنم ..
"چیم داوە لەو کولەکانەی کە دەبێ هەر بشکێ"
کە دەستم وا لە بنی هەمانەوە دەرچووە
دەست دەبەم بۆ هەرچییەک نیە ..
هەرچی هەیە دزراوە ..
وتراوە ..
بیستراوە ..
بینراوە
دەست دەنێمە بیناقاقای یەکە یەکەی شیعرەکانم و
هیچ نهێنیەک نادرکێنن ..





دەست دەخەمە ژێر چەنەم و
لە تەنیایی پەنجەکانم رادەمێنم ..
کە رۆژێک لە سەمای دەستێکدا
خەریک بوو دەبوونە .. ماسی
خەریک بوو بەرەو دەریا بەرێکەون ..
بەرەو ئاسمان هەڵدەفڕین و
لێیان گۆڕابوو ..
زەوی و دەریا لە یەک دەچوون ..
زەوی و دەریا لە یەکدا بوون ..
زەوی و دەریا لە یەک لا بوون ..
باشوور هەر بە بیابانی مایەوەو

بیابان هەر ئەو سۆزانیە بوو
کە بێ ئیختیار کوردگەل دەچوونە جوتبوونی
"لەسەر سنگە نەرمەکەیەوە"پێکەکانی مەرگیان
فڕ کرد .. !!
تۆ بۆ ئەوەندە بێ گوێیم دەکەیت ..؟
کە دەڵێم بگەڕێوە .. مەگەڕێوە
کە دەڵێم وەرەوە .. مەیەرەوە
کە هیچ ناڵێم .. شتێك بڵێ ..
تۆش وەکو من شێتانە تەماشای خەڵك دەکەیت ..
ناتەوێ لەو هەموو بێدەنگیە تێبگەیت ..
ناتەوێ گوێ لە منیش بگریت ..





من شیعرێك دەنووسم لە قسە بچێت ..
بۆ ئەوەی نەڵێن .. ئەوە شیعرەو هیچی دی
شیعر دەنووسم لە سرود بچێت
بۆ ئەوەی پێم بڵێن شۆڕشگێڕ ..
شیعرێك دەنووسم لەپەری بچێت
بۆ ئەوەی وابزانن ئاسمانیشم بینیوە ..
ئەمانە دێڕە ڕاستیەکانی منن ..
ئەمانەن کە من دەدەن بە کوشتا
من دەکوژن ..
من دەدەن لە خاچ ..
من دەهێننە پشتی ئەم مێزەوە

تا شیعرێک بۆ ناشیعرییەتی شیعر بڵێم ..
تا گوڵێک ببەم بۆ سەر دیوانی
ئیمامەکانی شیعر و
سرووتێ بۆ زیندوو بوونەوەیان بخوێنم ..
ئەوە ڕەهەندەکانی گومانە
وڕێنە دەکات بە شیعر ..؟
یان خەتاکانی ئێمەیە ..
ئەوە مەتەڵی شارەکانە
خاتیرەکان دەکات بە چیرۆک
یان ڕەنگەکانی عەقڵمانە ..





ئەوە بێ سەوادی ئێمەیە واوەیلاکان دەکات بە
ڕۆمان
یان نەبوونی قەڵەمی چاوتیژە ..؟
خۆ کەسێک نیە وەڵامێک باتەوە
نازانم ئەم هەموو پرسیارە بۆ ..؟
ئەم هەموو درۆیە بۆ ..؟
ئەم هەموو ..
ئەم هەموو .. گومانە چین
کە خەریکە کەللەسەرم دەکەن
بە تۆپی بەر پێی منالی سەر شەقامەکان ..
کە خەریکە دڵم دەکەنە سێوێک و

هێندەی نەماوە لە درەختیش بەرببێتەوە .. !!
تۆ ناتەوێ بێبیت ..
من دەزانم تورەیت .. بەڵام نازانم لە کێ
نازانم ئەم هەموو نازە چیە قوربان ..
هەر دەڵێم:
"لە ڕێی ئەو شۆخەدا خۆم کردە خاك و پێی نەنا پێما
دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم چ بکەم"
پێم دەڵێن شێتی .. شێت ..
کە دەڵێم:
"دەمێکە شاری پڕ شوری مەحەبەت مات و خامۆشە
بە قانونی تەجەنون شۆڕشێ ئینشا نەکەم چ بکەم"





کەس هیچ ناڵێ ..
ئیدی درەختەکان دەخەون ..
باڵندەکان هەڵدەکورمێن ..
منیش کز .. کز
لە گۆشەیەکدا خۆم دەبینمەوە
خەریکی کوشتنی خۆمم
"لەناکەس کاریا خاکم بەسەر ڕۆیی بەبا عومرم
خودا تۆ بمژێنە تا لەبەر قاپی کەسێ دەمرم"
گوێم لە هیچ نابێت .. ئەو شمشاڵە نەبێت
کە لێوی ڕەشەبا
بە ستونی کارەباکان دەیژەنێ ..

گوێم لە کۆترە شینکەیەکەو
گمە گمی ئەو
لە بۆلە بۆڵی منی بێ مەئوا دەچێت .. کە دەڵێت:
"ئەجەل دەورم دەدا دەڵێ حازر بە وادەی دەورو
تەسلیمە
منی غەفڵەت زەدە هێشستا خەریکی مەسئەلەی
دەورم"
جا تێدەگەم
"بە زایع چوو لە(مالایعنی)یا وەقتم هەموو یەعنی
دەبێ وەقتێ لە(بوالقت)ێ بخوازم دا تیا بمرم"
کەسێ نیە بمکوژێ و



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

وەقتێ نیە بۆ مردن ..
شەقامەکانی شار لە من چڵکنتترن
شۆستەکان لە من شێواوتر
گەڵایەك نابینم بزانێت بەرەو کوێ دەڕوات
هەر هەنگاوە بە یەکدا دەدات
هەر شانەو بەر یەك دەکەون ..
هەر ڕۆبۆتەو دێنە نزیکمان و
دوو حەرف دەبەن و دڕۆن ..
هەر درەختەو لەگەڵ دوکەڵی زبڵەخانەکاندا
خەریکی سەمایە و
بە گەردەلولی تێدەگات ..

هەر منم و کەسی دیکەی لێ نیە ..
هەر منم و کەسی دیکە هیچ ناڵێت ..
ئەم هەموو شیوەنە .. لە ئافات دەچێت ئەمڕۆ
ڕەنگە سبەی ببن بە وشەیەک
لەسەر دیوارێکی نیوە ڕوخاودا بنوسرێنەوە ..
ڕەنگە نەبن بە هیچ ..
هیچ هەموو شتێکە لێرە
لێرە هەموو شتێک هیچە
هەموو شتێک هیچە لێرە ..
من لێرە ڕەشەبایەکم و هەڵناکەم
پایزێکم و بەسەر ناچم





دارەمەیتێکم و تەرمی شیعر کۆ دەکەمەوە
شێتێکم و وڕێنەکانم وەکو شیعر دەنووسمەوە
ئێمە لە خودا رادەمێنین و
لە خۆمان .. نا
ئاوڕ نادەینەوە لە ناشیرینیمان
هەر ڕێ دەکەین و شەقامەکان پیس دەکەین
هەر ڕێ دەکەین و نازانین بەرەو کوێ
هەر ڕێ دەکەین و ناگەین بە هیچ
هەر ڕێ دەکەین و لە جێی خۆمان چەقمان بەستووە
..
کەمترین .. لە گۆیندەکانی ئاوازی شەڕ

کەمترین .. لە کەناڵەکانی درۆ
کەمترین .. لە خۆمان و
لەو ناوەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ
فووی پیا دەکەین تا گەورەتر بێتەوە ..
ئێمە کارمان بچووک بوونەوەیە
بچووکترین .. لەو مێروەی
کە لە شەقامەکاندا پێی پیا دەنرێت
بچووکترین .. لەو گەردەی
لەسەر پەنجەرەیەک دەنیشێتەوە ..
ئێمە بەر لەوەی کەشکۆڵی سەفەری
بەرەو بوون هەڵگرین .. گەورە بووین





لە عەدەم جوانتر بیرمان دەکردەوە ..
لەوێ لەگەڵ هیچدا هیچ بووین
لێرە لەگەڵ هەموو شتەکاندا هەر هیچین ..
من دەزانم هەموو چاوەڕێی موفتیەک دەکەین
بمانکات بە پیاوی جوان .. جوان
بەڵام ئەویش لە ناشیرینی خۆیدا نوقمی درۆیە
ئەویش وەکی ئێمە پڕە لە گوناه
پڕە لە حەیرانی درۆکانی ئەوان
پڕە لەو گوڵانەی کەس بۆنی پێوە ناکات
پڕە لە درک و خاکساری نەفرەتییەکان
پڕە لە هیچ و .. پڕیشە لە عەقڵی ئێمە ..

ئێمە شەوان کە دەخەوین
دڵمان سرودەکانی بەیانیمان
بە پەشیمانی دەڵێتەوە ..
ئێمە پەشیمانین لە هەموو ڕاستیەکانی خۆمان
چونکە هەرگیز نەمانویستووە ڕاستگۆ بین
نەمانویستووە گوڵ وەکو گوڵ ببینین
نامانەوێ دڕک ناشیرین بێت
نامانەوێ هیچ گۆرانیەکمان بۆ بڵێن ..
گەر نەوارەکانیش پڕ بووبن
لە گۆرانیەکانی دەم بەیان و
لە نهێنیەکانی ئەو بارانەی





کە ڕەنگە تنۆکێک لە زاهیدی تیادا بێت ..
ڕەنگە چەپکێک لە بەرائەتی هەڵگرتبێ
تا بە دیاری بهێنێت بۆ زەوی ..
ڕەنگە حوکمی ئاسمانی تیابێت
کە ئێمە نە لە دۆزەخ
نە لە بەهەشت شوێنمان بۆ نەگیراوە
دەبێت بە پێوە بوەستین تا ڕۆژی حەشر..
دەبێت لەگەڵ خۆماندا ئاشت ببینەوە
تا لە خۆمان حاڵی بین بەر لە مردن
تا بزانین خۆمان چیمان پێیە بۆ ژیان ..
کەس لەم شەقامانە نایینرێ چاوەڕێی فەتوای بێت

کەس لەم شەقامانە نیە چاوەڕێی هاتنی ئێوە بێت
چاوەڕێی  ئێوە بێت ..
کەس نەماوە سرووتی بالأبوونی قەدەر لەبەر نەکات
کەس نەماوە کە نەزانێت
ئێمە هەموو ڕۆژێ  سەرقاڵی نووسینەوەی درۆین
ئەو درۆیانەی کە ناکرێت بەردەوام بێت
ئەو درۆیانەی خاوەنەکەی ڕووی نایە بیڵێت
ئەو درۆیانەی ئێمەی دابەشی دوو کردوە
ئێمەی وەکو ژەمە خواردنێک لەبەردەسترایەو
دەزانێت چۆنمان فڕیو دەدات ..



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

دەتوانێت هەر ڕۆژەو لەسەر ریتمێك سەمامان
پێبکات
دەتوانێت بە کون بە فەیەکونێك
بمانکات بە ئەرستۆو
بمانکاتیش بە وێڵێکی سەر شەقامەکان ..
چیمان داوە لە دابەشبوون
خۆ ئێمە زۆرمان ماوە وانەی بیرکاری بخوێنین
چیمان داوە لە ئاڵقە لە گوێی
خۆ ئێمە دەمێکە نەفرەت لە کلکایەتی دەکەین
خۆ ئێمە وا دەزانین دەتوانین هەموو ڕۆژێ
دەجار لە ئەی ڕەقیبەوە دەست پێبکەینەوە

دە جار حەرفەکانی یەکری بخوێنینەوە
دە جار .. دە .. درۆکانی خۆمان بژمێرین ..
درۆکانی ئەوان بژمێرین
درۆکانی شاخیش روونە ..
درۆکانی شەقام دەزانین
کە باسی هەناسە تەنگی دەکات ..
درۆکانی رەشەبا دەزانین
کە باسی دەربەدەری دەکات ..
درۆکانی شۆستە دەزانین
کە سکالایەتی لەدەست نەمانی
بستێک لەسەر سنگی بۆ پیاسەی ئێواران ..





ژیان بە درۆوە جوانە .. هاوڕێ
لێی گەڕێ با سەری گەمژەیی خۆی نەدا بەو ئاوێنەیەدا
کە خۆی لێوە دەبینێ ..
لێگەڕێ با ولات بە درۆکانی ئێمەوە
سەمای وەک راستی کردنی درۆ بکەن ..
لێمگەڕێ با درۆکانم هەمووی بنووسمەوە
با درۆکانم هەمووی بکەم ..
با لە درۆ خاڵی بیمەوە ..
لەوانیش بگەڕێ
با چیدی هەواڵەکانمان بە درۆ بۆ نەخوێننەوە ..
با رۆژنامەکان پڕ نەکەن لە درۆی شاخدار

با مانشێتەکانی نەکەنە
مینبەری درۆ ڕەنگاڵەکانی فریودان ..
ژیان بە درۆوە جوانە .. هاوڕێ ..
سکاڵای چیتە لە دەست درۆ ؟!!
ژیان بەبێ درۆ فاڵتۆیە .. هاوڕێ
هاواری چیتە لە دەست درۆ ؟!!
ژیان خۆی درۆیەکی جوانە .. هاوڕێ
دەبێ هەموومان درۆکانمانی بۆ بهۆنینەوە
ژیان لە درۆ دەرکەیت دەمێنێتەوە هیچ .. هاوڕێ
ئەمە بیردۆزی شێتێکی عاقڵە
ئێمە هیچین ئەگەر درۆ نەکەین ..





ئێمە هیچین ئەگەر هەموو شتێک بە درۆ نەبینین ..
ئێمە هیچین ئەگەر مردنیش بە درۆی ژیان تێنەگەین
..
عەیامێکە من گازت دەکەم و
یەک ئاوڕیش نادەیتەوە ..
عەیامێکە من لێت دەپاڕێمەوە و
یەک سۆز نەماوە لە دڵتدا ..
عەیامێکە تۆش بوویتە بەو درۆیەی
کەس نازانێ تەفسیرێکت بکات ..
ئێمە لە باخچەکانی غوربەت
هەزاران گوڵمان چاند و هەڵوەرین ..

هەزاران نەمامان رواند و گەورە نەبوون ..
هەزاران دەقمان نووسی و نەبوونە شیعرێک و
هەرگیز نابنە شیعرێک ..
لە کۆلانەکانی موحیبەتدا
سەمامان بۆ هاتنی بەرائەتی عیشق دەکرد ..
شیوەنمان بۆ بە گولکردنی دڕک دەکرد ..
پیاسەمان بۆ دۆزینەوەی خۆمان دەکرد ..
دەگەڕاین و هیچمان نەدەدی لەخاچ بچێت
تا هەموو گرگنەکانی سوڵتانی پیا هەڵواسین ..
هەموو دیوارەکان دەبوونە ژوانگەی مەرگ و
نەدەمردین ..





هەموو چەقۆکان تینوو بوون بە خوێنمان و
تێر نەدەبوون ..
هەموو جەللادەکان لە خوێنی ئێمەیان دەخواردەوەو
کەسێ نەبوو سەریان بکوتێتەوە ..
کەسێ نەبوو لە دواوێستگەی نەفامیماندا
حەیرانێ بۆ بێخەمیمان بچڕێ ..
سروودێ بۆ تا سەرئێسک گێلێتیمان بڵێتەوە ..
هەی لەو گوێڕایەڵییە سەیرە ..
خۆ من حەیران ناڵێم ..
من دەگریم بۆ بچڕانی تەسبیحی هزرمان و
بۆ خلۆربوونەوەی دەنک .. دەنکی

بەسەر داروپەرددووی وێرانەی تێفکرینمان ..
خۆ من شیعر نالێم ..
نازانم بۆ هەموو بێدەنگەیان لێکردووەو
بە قفڵی درۆیەک دەمم داناخەن ..
من لەو ئێوارەیەوە تێگەیشتم
ئێمە هیچ نازانین
کە وامانزانی ژمارەی پێڵاوەکانیشمان
دیاری شۆڕشە بۆ ئێمەو
دەبێ ئێمەش ڕێزی لێبگرین و
خۆمانیش شایەنی ڕێز نەبووین ..
ئەمڕۆ تێدەگەم



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

کە ڕەش و سپی سەر بە تیرەی یەک عەقڵن و
دەکرێ یەک تابلۆ بکێشن بۆ سیاسەت
دەکرێ گوڵ و دڕک یەک بۆنی سیاسیان هەبێ
دەکرێ خیانەتیش ببێ بە خەبات
خەباتیش بە خیانەت ..
هیچ سەیر نیە ئەمە سوڕی
سەدەکانی سیاسەتەو هەر وا دێتەوە ..
ئەمە فەتوای سیاسیە کاڵفامەکانە ..
بەیانیش تێدەگەم لەوەی
کە دەبێ بکوژرێم .. چونکە نازانم شیعر بنووسم
نازانم چەپڵە بکوتم بۆ ئەوانەی لێیان تێناگەم

نازانم لە ستایشی درۆدا
سەری ڕێزو نەوازش دانەوێنم ..
نازانم دوایین دێڕی ئەم شیعرە بنووسم ..
نازانم دوایین دێڕی ئەم شیعرە چیە ..
نازانم کێ دێت و بۆم تەواو دەکات ..
هیچ نازانم ئەوەندە نەبێت
کە دەکرێ لەوە زیاتر هیچ نەڵێین
دەکرێ هەموو شتێکیش بڵێین ..
دەتوانین چاو بنوقێنین و
هەموو شەقامەکان بگەڕێین ..
دەتوانین پەنجە بئاخنینە گوێمانەوەو





هەموو شتێک ببیستین ..
دەکرێ دەمی خۆمان داخەین و
هەموو شتێکیش بڵێین ..
دەکرێ کتێبخانەکان بسوتێنین
تا چیدی کەس نەزانێ قسە بکات ..
ئەوەتا شۆڕش بەڕێوەیە
شۆڕشی جاهیلە زەبەلاحە هیچ نەزانەکان ..
شۆڕشی بەرەو پاش هەنگاوان ..
ئەوەتا ئێمە دەچینەوە ژێر پەرچەمی نەزانین ..
دروشمی درۆزنترین پیاوەکانی سەردەم دەڵێینەوەو
بەیداخی نەفرەتیترین مەعریفە رادەوەشێنین ..

لە سەرەتاوە خۆشم وامزانی شیعر دەڵێم
وامزانی شیعرێک دەنووسم
دواجار تێگەیشتم
دوا وەستێت دەکەم ..
تێگەیشتم کە من وێڵی مەقسەڵەیەکم و
ئەوانیش لە کونە تاریکەکاندا دەیشارنەوە ..
لێرە ئەو چاوانەی گوێ لە شیعر دەگرن
کەمترن لەو گوێیانەی شیعر دەبینن ..
ئەو دانیشتنانەی لە حزوری شیعردا پیر دەبن
زۆرترە لەو زانینانەی شیعر چیە ..
ئەو کۆڕانەی کە لێرە دەیگێڕین



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

هیچە .. هیچ
هیچتریشە لە وتنی وشەکانی ناو جارە ..
ئەو کەنارانەی ئێمە مەستی ڕاکشانەکانی بووینە
جگە لە شەپۆلی خوێن هیچی دیکەی تیا نیە ..
ئێمە جوانترین پەپولەمان کردە قوربانی
بۆ هاتنی سوڵتان .. چیدی داوای بەخشین نەکەین
باشە
چونکە خودا لەسەرەوەیەو
شانۆی هەرزەیی ئێمەی لێوە دیارە ..
ئەوان کە کەس نایانبینێت ..
دەتوانن هەموومان ببینن ..

سیمایان ڕتوشی خوداوەندی کراوەو
دەبێ لەبەردەمیاندا کڕنووش ببەین ..
چ پەرستگایەکی نابوورە وڵاتی من ؟!!
چ پرسەخانەیەکی بێ تامە ئەم شارە ..
ئێمە یەک کانیشمان نەماوە شیعری بۆ بڵێین
کەچی پەلکی دەریاکانی ڕۆژئاوا دەگرین و
سەرخەوی نووسینە پڕ درۆکانی لە کەناردا دەشکێنین ..
هیچ ڕۆژئاوایەکمان سەرنجڕاکێش نیە ..
هەموو شیعرێکمان پڕە لە غروب ..
پڕە لە خەوتنی خۆر ..
تۆ کە بڕیارە نەیەیتەوە هاوڕێ





ماتەڵم مەکە بە دیار کامڵبوونی عەقڵەکانەوە ..
وەرەو بمبە بۆ ئەوێندەر
لە تەنیشت بەهەشتەکانی ئەوێوە
با بگەڕێین بۆ قاچاخەڕێیەک
تا لێوەی هەموو کتێبەکان بپەڕێنینەوە
چونکە زۆرمان ماوە بۆ فێر بوون و دەمانکوژن ..
زۆرمان دەمێنێ بۆ وتن و قفڵی تاهەتایی لە دەممان دەدەن ..
هاوڕێ .. من سوێند دەخۆم بەرەنگی خوێنەکەت
ئەگەر تۆ خەریکی کۆکردنەوەی دەنکە میروەکانی
کەرامەت نەبای

هیچ گوللەیەک ڕێی ماڵی دڵتی نەدرۆزیەوە
هاوڕێ .. ئەدرەسی ئێمە مەدە بەو تیژڕەوانە
دڵی ئێمە خاو لێدەدات ..
ئێمە ئارەزووی مردنی خوێناوی ناکەین
ترسنۆکین .. پەحێکمان بەسە بۆ مردن
تفێکمان بەسە بۆ عاقڵ بوون
شەقێکمان بەسە بۆ ئیفلیج بوون
مشتێکمان بەسە بۆ گێژبوون ..
دەزانم تۆ بە قەڵەمێکەوە
بەری لولەی تفەنگت دەگرت
تا بچیە خزمەتی مردن





ئەوە بە ئێمە ناکرێ ..
"گۆڕستانەکان پڕن لە کەسانێک کە وایان دەزانی
ئازان"
من لە جوانترین سپێدەی شاردا
زۆرترین مەرگم بینیوە .. تۆ چی دەڵێی بڵێ ..
من لە ساردترین ڕۆژیساڵدا
زۆرترین سواڵکەرم بینیوە بە پێی پەتی ..
تۆ چی دەڵێی !! بڵێ ..
من لە درێژترین شەوی ساڵدا
تا بەیانی بە شیعرەوە بۆ عیشقزەدەکان گریاوم
تا بەیانی شەوارەی خەمم بۆ گرتوون ..

تۆ چی دەڵێی من گوێت لێناگرم ..
هەر وەکو چۆن لێرە کەس گوێ لە من ناگرێ ..
هەر وەکو چۆن کەس لێرە
بۆ هیچ دێڕێکی من سەر ناڵەقێنێ ..
جێت دەهێڵم دوو چرکەو خەڵکی دانیشتوون
وادەزانن شتێکم پێیە بۆ ووتن
وادەزانن .. لە قوڵترین فۆڕمی زاراوە
مرواری شیعرم پێیە ..
وادەزانن شەڕی من لەگەڵ ئەوان نیە
وادەزانن تەنها ڕەشکردنەوەی کتێبێکی دیکەیە
من کوێ بگەڕێم بۆ گوێگری باش



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

لە کوێی دیکە ئەم نووسینە ناتەواوە بخوێنمەوە
من وا گەڕامەوە هۆڵەکەو
دەکرێ کەسێك پرسیار بکات ..
پێدەچێ کەسێ بیەوێ شتێك بڵێت
کە هەموو دەزانن شتێکم نەووت ئەمڕۆ
ڕەنگە کەسێك بێت و
شیعرەکەم لەدەست وەرگرێ و
هەنجن .. هەنجنی بکات
کە دەزانێ هیچی لێ تێناگات ..
یان دەزانێت کەس لێی تێناگات ..
چیمە تاوان ڕێمبدە بڕۆمەوە لایان

ئەوان وا خەو دەیانباتەوە
ڕێبمرە دێرێکیان بۆ بخوێنمەوە
من هێشتا هیچم نەوتووە ..
ئەوان پاش ئەم دێرە
لە دەرەوە قاقا لێدەدەن بەزۆر بڵێیی و نەزانینم ..
بەڵام تکایە فێریان بکە چۆن گوێ بگرن و
چۆن تەماشا بکەن و
چۆن قسە بکەن ..
ئەوان پێدەچێ مەرەکەبیان پێ نەمابێ
بۆیە نایانەوێ زۆر بنووسن ..
وەکو من لمیان دەست ناکەوێ لەسەری بنووسن و





پاش خوێندنەوەی بە نووکی پێڵاو بیسڕنەوە ..
هەموو دێرەکانمان وەکو دەقێکی سواوە
هیچ کەسێ حەوسەڵەی خوێندنەوەی نیە
هیچ کەسێ نازانی چی دەڵێین ..
کێ دەتوانی ڕابەری بزاڤێ بکات تا بنووسین ..
ئێمە هێشتا فێری خوێندنەوەش نەبووینە ..!!
فێر نەبووینە شتێک بڵێین هی خۆمان بێت ..
کەچی لە سەوزترین باخچەدا شیعر دەخوێنینەوەو
وا دەزانین دەکرێ گوێمان لێبگرن ..
شیعر ئایەتی شاعیرەو
ئێستا بە دەستی مناڵە چەتونەکانەوە

بووە بە کۆلارەو لە هیچ ئاسمانێکدا نافڕێت ..
ئاسمان شەرمەزارە و نازانێ کۆشە پڕ ئەستێرەکەی
کەی بتەکێنێ لە گوناهی ڕوانینە شەهوانیەکانی ئێمە ..
گوڵ خەجاڵەتی دەکێشێ و
دەیەوێ پاک بێتەوە لە بۆنکردنەکانی ئێمە ..
پەپولە دەیەوێ تەوبە بکات لە بەرائەت
کە دەزانێ ئێمەین وادەزانین ئەو بەریئە ..
خاک بێزارە لە هەنگاوەکانمان
کە دەزانێ ئێمە گێل .. گێل
دەمانەوێ بست .. بە بستی سنگی
لە چاوەڕوانی هاتنێکدا



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

بە پێیە پڕ لە درۆکانمان بژمێرین
وەکو کاشیەکانی ناو ئەو دالانەی
کە چاوەڕوانی دیتنی کۆلکە سوڵتانێک دەکەین ..
ئاه .. ئەمە ئێمەین .. ئەمە
ئەمەیە کە ئێمە دەیشارینەوە و
نامانەوێ هیچ کەسێک بیزانێ ..
ئەوە ئێمە نین
کە قەڵەممان کردوە بە چقڵێک و
چاوی ناشیرینییەکان هەڵدەکوڵین ..
نا قەڵەمی ئێمە ..
بووە بە مەسکارای برژانگی درۆکانی ئەوان ..

بووە بە زوڕنای ئاهەنگی ئەفیون کردنی مرۆڤەکان و
هەر دەیژەنین و دەیژەنین و
کەسمان حەوسەڵەی تاوێ سەمامان نیە ..
کەسمان بە ئاوازی درۆکانی خۆمان قایل نابین ..
کەچی وەکو شێری بێشە
نەعرەتەی جوانمەردی خۆمان دەدەینە گوێی جیهان ..
وەکو هەڵۆ چاومان دەکەین بە هەزار چاو
تا فۆڕمی ئیستاتیکای شانی چەپمان بشێوێنین
تاگوڵی ئەو باخچانە پەژموردەکەین کەخۆمان نایڕوێنین..
ئێمەین پیاوە جوانەکانی ئەم شارە ..
هەر بۆیە شارەکەمان بەشی یەك وێنەی فۆتۆ



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

جوانی تیا نیەو نابینرێ ..
ئێمە نەسخی هەموو ئایەتەکان دەکەین و
تەئویلێکمان نیە بۆ ستایشەکانمان ..
تەکفیری هەموو ئەو حەرفانە دەکەین
کە ڕەنگە بەیانی لە بڵندگۆیەکی کەم سەداوە
بێتە بەردەم منارەی کورسیەوانەکان و
ناقوسی دەبەنگیان بزرنگێنێتەوە ..
چیدی ئەوەندەین ..
زیاتر نین و نابین ..
چیدی هیچمان پێ نەما
ڕەنگە جوانتر وابێ

قەڵەمەکان بسپێرین بەو گۆڕستانەی
کە گڵکۆی پیاوەکانی قەڵەمی وا تیادا دەدرەوشێتەوە ..
چیدی لەوە زیاتر نین کە لێرە هەین ..
کە هێندەی هیچێک نابین و
وا دەزانین هەموو شتێکیشین ..
چیدی کەمترین .. کەمترین لەو قەبارەیەی
کە فۆڕمی ئێمەیەو
خۆمان خاوەنی نین ..
ئێمە مناڵە گوێڕاڵەکانی ئەوانین و
کۆرسی ئەو دروشمانەین
کە نە لە سروود دەچێت و





نە لە حەیران دەچێت و
نە لالآنەوەی تەواویشە ..
دەنگی ئێمە هێندەی دەنگی بۆقەکانی ئەوانیش نیە ..
کە رەنگە کەسێک لێی بترسێت ..
ئەو بەیانیەی کە بەربەستی رووباری خوێن دەکرێتەوەو
ئێمەو حەرفە درۆکانمان دەچینە گریان ..
بولبول پێرەکەنێ و
چرا بۆ بەدبەختی خۆی شیوەن دەکات
کە رەنگە سەدان شەو ژووریکمان بۆ رۆشن بکاتەوە ..
باخچە پرچی لە گەڵای زەرد دەرنێتەوەو
قەرسیل هەر خەوتووە مەست .. مەست ..

ئەو ئێوارەیەی کە کەس ناگەڕێتەوە ماڵێ
ئێمە واین لەسەر مێزەکانی ئەو بارەی
کە جگە لە ئێمە
پێکی هیچ کەسێک خاڵی نیە لەوێ ..
ئەو شەوەی کە هیچمان نیە بۆ ووتن
زۆرمان پێیە بۆ سکالاّ ..
بێ هەژمار گلەیی رۆ دەکەین ..
وا دەزانین ئیدی بووین بە خۆمان ..
بووین بەوەی کە دەبێ ببین ..
بووین بە هەموو شتێک و نەبووینە خۆمان ..
کە وادەزانین پڕین لە مەعریفە ..





پڕین لە هیچ .. پڕین لەو دێڕانەی
کە باشتر وایە نەنووسرێن ..
پڕین لەو دێڕە سادانەی
کە من لە سەرەتای ئەم شیعرەوە دەینووسم و
وادەزانم شیعرە ..
وا دەزانین شیعر ئەوەمان دەداتێ کە نیمانە ..
من ناتوانم ئەو شمشاڵە لە لێوی کەس بکەمەوە
کە ئاوازی شەهادەت بۆ زیندووەکان دەژەنێ ..
هەروەک ناتوانم هیچ زیندوویەک لە مردن خەبەر
بکەمەوە
مردووەکان زیندووترن تا ئێمە

مردووەکان ئازاترن تا ئێمە ..
مردن گەورەترە لەو ژیانەی
کە تەنها بە درۆوە جوانە و
کە بەبێ درۆ هەر زوو دەمرێ ..
هەر زوو راستیەکان ئەرشیف دەکات
بۆ تەنیشت شەو خەوتنەکانی تەنیایی ..
هەر زوو دەبێ بزانین کە ئێمە چاویلکەکانمان وون
کردوە
با بۆ هیچ نەگەڕێین نەکا هەر هیچمان چنگ کەوێت ..
دەمەوێ بڵێم: دوایین دێڕ .. ناوێرم
دەمەوێ دوایین دێڕ بنووسم هەر ناوێرم





دەمەوێ پێتان بێژم: چیتان ژنەفت؟
پێرەچێ نەوێرن هیچ بڵێن ..
نەوێرن دەمی چەنەبازێک
بە تەنها یەک پیتی جوانی وەک درۆ .. دابخەن ..
لەو رۆمانانەوە سەر دەردێنین
کە هێشتا نەنووسراوەو کەسیش نایینووسێ ..
لەو چیرۆکانەوە گەورە دەبین
کە هەرگیز کەس نایخوێنێتەوەو ناخوێنرێتەوە ..
لەو پەخشانانەوە فێری نامە نووسین دەبین
کە تەنها درۆی هۆنراوەن و لە درۆش کەمترن ..
لەو شیعرانەوە تاجی نووسین دەدزین

کە تا هەتایە کەسمان لەسەری نانێین و
کەسمان سەرێکمان نیە بۆ ئەو تاجە بشێ ..
ئەی خودا .. تۆ بڵێی سەوڵێک مابێ
تا ئەم قەیاغەی پێ ببەینەوە کەنار ..!!
ئێمە نە دەریاوان بووین و نە مەلەوان
نەفرەتی نەزانین لە نێو ئەم دەریایەدا توڕی داوین
..
ئەی خودا .. تۆ بڵێی کەشتیەک لێرەوە گوزەر بکات ..!!
تا هیچ نەبێ .. کەسێکمان دەرباز بێت لەم گومڕاییە ..
گەر ئەمڕۆش وەکو دوێنێ بەبێ خەیاڵ ..
گەڕاینەوە نێو داروپەردووی کوێریی ..





چیدی گلەییمان نامێنێ لە قەدەرەکانی تۆ .. ئەی خودا
چیدی ئێمە ئەو نەفامەین کە چاوەڕوانی
چرا سیحرییەکەی عەلادین دەکەین لە خەونێکدا
دەستمان کەوێت ..
هێی .. ئێوە .. ئەی ئەوانەی نە لە نۆتەی
مۆسیقارێک و
نە لە ئاوازی گۆرانیبێژێک و
نە لە ناڵەی شاعیرێک تێدەگەن ..
پێتان وا نەبێ لە تەنیشت کورسیە قاچ شکاوەکانەوە
هێشتا سەلاوێک مابێ بۆ گیانی شەهید ..
وانەزانن کە دەکرێت سەری ڕێزو نەوازش

بۆ هەموو میرخاسەکانی هەرێمی خەوتن دانەوێنین ..
ئێمە کە پەنجەرەکانمان هەمیشە کراوەیە
لە چاوەڕوانی شەماڵێکی بێ مەئوادا
نابێ بترسین لە هاتنی ڕەشەبا ..
ئێمە کە دەنگی دەهۆڵەکەمان لەم مەحشەرەدا بێ
سەدایە
نابێ لەسەر ریتمی شەپۆل هاژو هوژ کەین ..
ئێمە گەر لە گۆڕی زەردەشتیەکانەوە بیر لە ئەمڕۆ
نەکەینەوە
سبەینێ بنمیچی مزگەوتەکان
جارێکی دی بە مێشکی ئێمە سواق دەدرێتەوەو





گلکۆکەشمان دەبێتە"گۆڕە جولەکە"و هەمیشە سەنگسار
دەکرێین ..
چ پڕ ترسە ئەم گریانە کە شیوەنێکە .. بێ تۆ
ئەی تۆ .. ئەی ئەوەی لە ماوەی قەسیدەیەکدا
دە جار(یاهو)ت بۆ دەکەم و تۆش خەوێک دەتبا و
نازانم بۆ کوێ ..!!
ئەی شێتتر لە من و شێواوتر لە شیعرم
گەر هەر نایەی .. پێم بڵێ ..!!؟
تا چیدی ئەم شانەیە بشکێنم
کە دەمەوێ پرچی خەمەکانتی پێ دابهێنم ..
من لێرە لەگەڵ پیرترین خەیاڵی شەوەکانمدا

شیعرێک دەڵێم کە بفرێت ..
خۆشم نەزانم بەرەو کوێ ..!!
من ئێستا گیرۆدەی دوایین دێڕم و نازانم چی
بنووسم ..
تۆ هەمیشە دونیات لەلا دەبێتە ئاوێنەو
خۆت و شیعر و ژیانیشی لەبەر دادەهێنێ ..
من پەلکی شیعرم بە برینگی غەفڵەت دەقرتێ و
نابێتە شیعرێ تا بیخوێنمەوە رۆژێ ..
تۆ هەر دەرناکەوی و ئێمەش لە چاوەڕوانی هاتندا
پیر دەبین و هەر نایەیت .. نا
وا دەزانیت کە بەبێ تۆ شتێکمان دەبێ بۆ ووتن ..!!





من هەرگیز تەنیا نیم
کە هەمیشە .. خەم لەگەڵما پیاسە بکات
نازانم .. بۆچی وادەزانم کە تەنیام ..!!
ئەی ئەو کەنارییەی
لە قەفەسێکدا پێدەکەنێ تەنیایە ؟!!
نا .. نامەوێ بڵێی دەگری
چونکە ئەویش خەمێکی لەگەڵەو بۆی پێدەکەنێ
ئەوە گریان نیە ئەزیزم کە دەستی دەگرێ بۆ نەغمە ..
من هەرگیز بە تۆوە جوان نیم
کە هەمیشە وادەزانی رەنگی گوڵت گرتووە
نازانم .. بۆچی وادەزانی کە تۆ گوڵی

ئەی ئەو گوڵەی لە باخچەیەکدا شیوەن دەکات
هەر گوڵە ؟!!
نا .. نامەوێ بڵێی لە حەژمەتدا وا هەڵدەوەرێ
چونکە ئەویش شیلەی عومری بە ماچ
دەبەخشێتە پەپولەکان ..
ئەوە شیوەن نیە ئەزیزم کە دەستی دەگرێ بەرەو
هەڵوەرین ..
هەر چەندە تۆ بۆیەکانی بەردەمت تێکەڵتر بن
هێشتا تابلۆی ماچێکی نیوە شەوت پێ ناکێشرێ
بەسیە ئەم هەموو دانیشتنە لەگەڵ پەڕەمووچەکاندا ..
هەر چەندە من خەمی زیاتر کۆبکەمەوە لە شەقامەکاندا





هێشتا شاکارێکی جوانم پێ نانووسرێ
ئیدی بێ هودەیە ئەم هەموو خەمنووسینە ..
شێتیە شیعر ووتن بۆ تۆ و
گێلێتیە روانین لە دوا تیشکە لاوازەکانی غروب
من گەر تابلۆیەکی تۆم ..!!
بۆ نازانی رەنگێ بدەیت بە نیگاکانی لای بەیانیم ؟!!
بۆ نازانی لەگەڵ توڕەبوونێکدا لەت .. لەتم بکەیت و
توڕەم دەیتە سوچێکی ژوورەکەت ؟!!
بۆ .. بۆ نازانی لە گەڵەری حەزێکتدا هەڵمواسی ؟!!
"من ناشیرینترین تابلۆی تۆم" ..
ئەمە کچێک پێی ووتم

کە نازانێ هیچ نیگارێک بکێشێت ..
تۆ لە تەنیاییدا ڕەنگەکانت تێکەڵ دەکەیت و
ئەویش لە تەنیاییدا
بە دەست داهێنانی پرچەکەیەوە دەگری ..
ئێوارەیەک کە نە شەماڵێک هات و نە شنەیەک
گوێم لە ستونی کارەباکان بوو ..
باسی ئەو ڕەشەبایەیان دەکرد
کە نیوەڕۆ ختوکەی ڕۆحی دابوون و
بە لورە .. لورەوە کەوتبوونە پاڕانەوە لێی ..
من لە نێو ئەم هەموو نەسیمەی ڕوئیادا
پەلکە گیایەکم وەختە عومرم دەبەخشمە دێڕێک ..





قارچکێکم لە بن درەختی عیشق هەڵدەتۆقم و
قژم چەتر و سێبەری خاڵخاڵۆکەکانە ..
سۆفیەکم بە تەریقەتی ئاو تەقواکانم ئەدا دەکەم
پەڕندەیەکم لەسەر ریتمی گریان دەخوێنم و
بە دەستوری سەفەر لە باڵ دەدەم ..
دڵم هێندەی گەردێکی سەر پەنجەرەی ژوورەکەمی ماوە ..
وەختە دەبم بە قوربانی ئەو بازنەیەی دەروێشێک دەیکێشێ
بۆ ئەڵقەی زیکرێکی پڕ گوناهی شەوان ..

وەختە دەبم بەشوێن پێی مێروولەیەک لەسەر دڵی
لەتیێ نان ..
وەختە نابم بە هیچ و دێمەوە بەرەو ماڵێ ..
وەختە لە بیر دەچمەوەو
نازانم فوو بکەم بە چ کەڕەنایەکەوە
تالەشکری وشەیەک بەڕێکەم بەرەو مەملەکەتی
پەڕەکان
لەوێ بەدەستی جوانترین خەیاڵێ خۆم بدەم بە کوشتا
..
ئای چ مردنێکی غەریبە
من لە نێو گەمەی پەنجەکانی تۆدا





رۆحم دەهاتە سەرو دەگەڕایەوە جێی خۆی ..
تۆ واتدەزانی ئەوە ئەزموونی نوستنەکانی منە
لە باوەشی ژنە عەیارەکاندا
فێریان کردووم لەگەڵێ ماچدا شەڕ بکەم و
لەگەڵێ تێکئالأندا زۆران بگرم ..
نا .. ئەوە شێتی شەوانمە فێرم دەکات
کە نەتوانم ئیدی تۆم خۆش بویێ و
نەتوانم ئیدی سوژدە ببەم بۆ روگەی تۆ ..
من کە نەزانم ماچەکانت بنووسمەوە
بۆ چیمە ئاڵترین ماچەکانی تۆ ؟!!
چی لە باوەشی پڕ سۆزت بکەم ..

چیم داوە لە بۆنی بسک و لاگەردنت ..!!
ئەمەیان حەیرانی سەردەمی نەبوونی ووشەی منە
کە دێڕی ئاوهام پێ دەنووسن و
زۆر جاریش وادەزانم بوونە بە شیعر ..
من ئەو بلوێرەم بە لێوی شوانێکەوە شەهید دەبم ..
کەچی هیچ ئاوازێکی .. بۆ چلەی ماتەمینیم ناگری ..
من بنچکە دەوەنێکی نێو زنارەکانی چیاکانی کوێستانم
کەچی هیچ مەلێک نایاتە سێبەرم ..
چ سەراسیمەیەکە
من لە نێو گەردەلولی یەئسێکدا وەختە دەمرم ..
کەچی هیچ مزگەوتێک





بۆ شەهادەتم تەراتیلەکانی نالێتەوە ..
هیچ تابوتێک نایاتە سەر مردنم
کە کت و مت لە شەهید دەچم ..
هەمیشە وادەزانم تەنیام و شیعر بۆ تەنیاییەکانم
دەنووسم
هەمیشە وادەزانم کەس ئاگای لە سوتانەکانی رۆحم
نیە
کە بۆکڕوزی لوتی ئاسمانی پڕ کردوە و
دەنگیش ناکات ..
هەمیشە پێت دەڵێم: ژیان بە درۆوە جوانە و
هەمیشە تورە دەبی لێم .. دەترسی راست بکەم ..

ئەوە من نیم کە فەلسەفەی وەکو درۆ بینینی ژیان
دەنووسم
ئەوە منیش نیم کە دەڵێم: من درۆکانم دەنووسمەوە
ئەوە درۆ خۆیەتی هەمیشە لەگەڵ هەموو دێڕێکدا
فێرم دەکات زیاتر درۆ بکەم ..
بەڵام پێدەچێ ڕۆژێکیش ڕێی ڕاستیم پیشان بدات
پێدەچێ ڕۆژێک فێرم بکات بەڕاستی بمرم و
ئیدی گوێ لە درۆی عاشقبوونی تۆ نەگرم ..
من بەرگەی عیشق ناگرم ئەزیزم
بەسیە درۆ واز بێنە ..
من بەرگەی گریانەکانی تۆ ناگرم





بەسیە شیوەن بۆ ژیان ..
بۆ دەتەوێ ورشەی هەموو ئەستێرەکان بدزی
تا لە ئێوارەیەکدا لە مابەینی چەند دێڕێکدا
بیانکەیت بە نامەیەک بۆم ..
من تریفەی مانگیشم خامۆش کرد دەمی عاشقیم
کەچی دیوەخانی دڵی خانمێکی ڕوون نەکردەوە
تا ئەڵقەی عیشقی وەک ئاگری تیا جۆش بدەین و
سەمای ڕۆحمان
لە تەنیشت ئایەتەکانی پاکبوونەوەوە دەست پێبکەین
..

تۆ عاشقی ئەو گوڵانەی کە من لە ئینجانەیان
دەوەرێنم و
شێتی ئەو ماچانەی کە شەوان لەگەڵ دێڕەکاندا
دەیاننووسمەوە
کەچی تێناگەی لەوەی دێڕەکانیش پڕن لە درۆی وەک
ڕاستی ..
ماچەکان هەر درۆی ڕاستین و نایانبینی
تێکئاڵانەکان هەر درۆی ڕاستین و نایانبینی
ئۆرگازمەکان ڕاستی مردنێکی نابەڵەدن بە مەعریفەکانی
تۆ ..
من بە دیار فەشەلی نووسینەکانەوە





شیوەن بۆ بەدبەختی ئەو هاوڕێیانە دەکەم
کە چاوەڕوانی حەرفێکن ..
کە چاوەڕوانی لەدایک بوونەوەی پیری تاوەگۆزین
بێتەوە ئێرەو بڵێت:
"باڵەخانەی چەم دیوانەکەی تۆن
بانەنا وەگڵ ئاسانەکەی تۆن
تکەش عاجز کەرد خەیاڵت تیشرا
ئازیز بەو جاری پا بنیە پێشرا"
چاوەڕوانی شکانی قفڵەکانی سوقی دەهرن
گوێیان هەڵخستوە بۆ بڵنگۆیەک کە بڵێت:
"ئەوی ئەمرۆ بە دەوری تەختیایە هەلهەلەی مەخلوق

لەدەوری نەعشیا سبحەی دەبینیٚ وەلوەلەی مەخلوق

بە پەل پەل کردنی سبحەی ئەگەر ببوایە باوەڕیان

دەبوو قەت بەم حەدە نەبوایە بۆ دنیا پەلەی

مەخلوق"

چاوەڕوانی(عاشقەکەی شارەزوور)ن

بە سواری کەری قاتیعی ڕێی دوورەوە بێتەوەو

بچێتەوە ماڵیاواو حەبیبەیەکی چاو تیلی دیکە بگریٚ بەیار و

لە نامەیەکدا بۆی بنووسێت:

"شەوی یەڵدایە یا دەیجورە ئەمشەو

کە دیرەم دوور لە تۆ بیٚ نوورە ئەمشەو

دڵم وەک حاکمی مەعزولە قوربان



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

خەیاڵی وەصڵی تۆی مەنزورە ئەمشەو"

ئەو شەوەی کە خودا

تۆزی ڕووی ئاسمانی بە شەماڵێک لابرد

من لە دڵی تاریکی شارەوە

هێواش .. هێواش سرودێکم بۆ ژیان دەچڕی

ژیانێک کە لە باخەڵی ورگ زلە کەللە پوتەکاندا دەژیا و

لە ماڵی هەژارێکی برسیەوە هەڵهاتبوو

دەمووت: دەرچۆ لە منیش ئەی ژیانی هیچ

ئەی نەفرەتیترین خەونی شەو و ڕۆژ

ئەی ڕەدوو کەوتوو بۆ ماڵی گرگنەکان

دەمووت: ئەمرۆ و سبەی تەلاقت دەدەم

ئێستا .. نا ساتێکی دیکە وون دەبم لێت
تۆ ئەی ژیانە پڕ و پووچەکە ..
دەڵێن: گوایە زەمانێک بووە
کە ژیان وەکو ئێستا بێزراو نەبووە
دەڵێن: فریای چنینەوەی نەوەکانی بنیادەم نەکەوتووە
دەڵێن و .. دەڵێن و .. درۆش دەکەن
مێژوو وا ناڵێت .. دەڵێت: ژیان لەوەتەوەی هەیە
کەمتر نیە لە سۆزانیەکی ژێر دەوارەکانی بیابان
کەمتر نیە لە شمشێری دەستی جەللادە خوێنخۆرەکان
زیاترە لە مەکری فیرعەونی زوڵمستان و
زیاترە لە عەبای شانی شێخێکی جادوگەر





هەر لە نەوەی تەلیسمێکی پوچەڵ دەچێت
لە هەموو شتێک دەچێت .. لە ژیان نا
ئەو ڕۆژەی خودا
بە نەسیمێک بەری چاوی خۆری بەردا
لە شەقژنی باڵی چۆلەکەکانی حەوشەمان
چیرۆکی ئەو میوانانەم گوێ لێبوو کە نایەن بۆ ماڵی
ئێمە
نایەن سرووتی مەرگێ لە بن گوێی ژیانی من بخوێنن
نایەن من و دوو پەڕەو پێنووسێک ببینن
لە زیکری تێکئالاّنی ووشەدا
چ گیانەلاّیەکمانە ..

دێن ئەو دەمەی من نیم و
وەکو ئێستا گەمەی شەوو ڕۆژ
هەر وا بە چڵی کاتژمێرە پڕ چرکەکانەوە ووشک
بوونەتەوە
دێن و هەموو کتێبەکانی من دەبینن
لە گۆڕی کتێبخانەکەمدا تۆز خنکاندوونی ..
بووکە شووشەکانی خوشکەکەم دەبینن
بە دیار لای لایەی منداڵییەوە سەریان سپی کردووە
نامەی ئەو ژنانە دەبینن
کە خەونی بە کچ بوونەوەیان هێناوەتە
بەردەم دەرگای قەسیدەی "ژیان بەدرۆوە جوانە"



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

بۆنی شەوەکانی جوتبوون و
ڕۆژەکانی شەق و جنێویان لێدێ و
هەموو دێڕێکیان تنۆک .. تنۆک
فرمێسک بۆ جوان بوونەوە دەڕێژێت ..
من هەموو شەوێک هەزاران سروودم دەهاتە خەیاڵ
و
دەیان ئاوازی نەوترام دەگێزاندە ناو ژوورەکەم
دەنگی من .. زۆر ناخۆش بوو ..
وەکو دەنگی پەپوە خوێن تاڵەکانی شەو ..
لە چیرۆکی شەوێکمدا
باسی گورگەپیاوەکانم نووسیبووەوە

باسی گورگێتی خۆمم نووسی .. گورگێکی دان کولی
مەکراوی
باسی نێچیرەکانمم کردبوو
نێچیرە عەیارە فریو خواردووەکان
نێچیرە بێ حیکمەتەکان
نامەیەک هات و تەلاقی دام لە عیشق و لە شێتی ..
دەگریام بۆ شێت بوون و
سەمام دەکرد بۆ سەفەری عیشق ..
من کوالوانەکەی کۆلی نەنە حەبێم لە بیرە
هێندەی ئەستێرەکانی ئاسمان
تروسکەی تیا بوو بەیانیان ..





هەموو شەوێکیش چراکەی دەهێنایە سەر سەرم و
دەیووت: رۆلە نەخەوتووی؟
من تووشی دەردی نووسین هاتبووم و
نەنە حەبێ دەردی نوێژ ..
ئەو بەیانیان بە دەنگە لەرزۆکەکەی وەئاگای
دەهێنامەوەو
دەیووت: رۆلە هێشتا لە ماڵی ..؟!
من دەگریام بۆ نەبوونی شوێنێک بۆ پیاسەکانم و
هەنگاوەکانم پەشیمان بوون لە هەموو شوێن پێیەکانم
گولیلکە بەهارە حەوشەکەمی خواردبوو
رەشەبا دەرگای ژوورەکەمی شکاندبوو

ئاسمان هەموو کات چاوی لێ باز دەکردمەوە
وام دەزانی خودام لێ تورەیە
هەر شەوێک زیکری خودام کەم بکردبایە
گوناهەکانم باری شانیان قورستر دەکردم ..
هەر شەوێک بێخەم بنوستمایە ..
خەوم بە گریانی خەمە بێکەسەکانمەوە دەبینی ..
من و برا بچووکەکەم عاشق بووین
ئەو عاشقی کچۆڵەیەکی بەناز و
من عاشقی بستێ خاك بۆ گۆڕی خۆم ..
ئەو عاشقی پیاسەی ئێوارانی لای ماڵی یار و
من عاشقی پێنووسە مەکربازەکەم





ئەو عاشقی نامە رزاوەکانی دڵداری و
من عاشقی شیعرێکی شێتانەی نیوە شەو
من و براکەم هەردوکمان شێت بووین ..
ئەو شێتی سیمایەکی پڕ لە سیحر و
من شێتی شەوێکی تاریکی بێ چپە
ئەو شێتی گەورە بوون و
من شێتی منداڵی .. شێت بووین هەردووکمان ..
شێت
من شەوێک کە ماڵم وون کرد
چوومە دەرگای باخی گشتی بۆ سەرخەوێ
تەماشام کرد مانگەشەو بێزارە لە من و

لە خەوی تەنیشت حەوزە ئاوە لێخنەکەی باخی گشتی
..
بەیانیەک دەرگای ژوورەکەم چوو بە گیرا و .. نەکرایەوە
تا ئێستا نازانم چۆن هاتمە دەرێ
هێند دەزانم لە ناو یەکێک لە کوچە تەنگەکانی بازاڕەوە
لە سێبەری دیوارێکدا ببووم بە پەیکەر و
تا ئێستاش نازانم چۆن گەیشتمە ئەوێ ..
من دەمێک عەرەبانەکەمم پاڵ دەنا
کەس نەبوو هیچم لێبکڕێ ..
کەس نەبوو .. دەنگم بگات پێی
کەس نەبوو .. خۆم و تەرازووە شکاوە کۆنەکەم بووین





خەریکی کێشانی سەنگی ژیانی کولەمەرگی بووین
من دەمووت: ژیان هەر نیو ماچەو هیچی دی
ئەو دیووت: ژیان پارسەنگی مردنەو هیچی دی
من دەمووت: ژیان وا لە نێو شەوگاری پرچی ئەو کچە
ئەو دەیووت: ژیان وا لە نێو میحرابی مزگەوتەکاندا
من ووتم و وا نەبوو
ئەو ووتی و .. هەر ووتی و .. هەر دەڵێت
دەمێک لە بازاڕەکانی جەنگا خۆم هەڕاج کرد ..
تفەنگێک نەبوو بچمە جەنگەوە
گوللەیەک نەبوو بینێم بە خۆمەوە ..

من دەمووت: سەروەریی ئایندەیە خەبات
چەك دەیووت: پەشیمانی ئایندەیە گەمژەیی
من دەمووت: شەهادەت شەرەفی شێرانە
ئەو دەیووت: شێریش وەکو تۆ بەستەزمانە لەم جەنگە
تورە دەبووم و دەمویست چەك بكوژم
چەك زۆرمانی کوشت و نەکوژرا .. هەر نەکوژراو ..
هەر دەمانکوژێت
دەمی خیانەت من چوومە سەر هەموو کانیەکان ..
حەیرانی خیانەتیان نەبیستبوو لە شاخدا
ئاوازی قاقای براکوژیان بەر گوێ نەکەوتبوو ..
دەمی ژیری .. دەمی فرێدانی کەللەی گەمژەیی





بووم بە خائین و خوێنمژ
بووم بە ئەهریمەن و زەندیق .. بوومە هەموو
خراپێك و
هیچ خراپێکیشم نەبووم ..
بووم بە دوژمن و کەسم نەکوشت ..
بووم بە تێکدەر و هیچ شەقامێکم ئیغتیساب نەکرد ..
بووم بە پیاو و .. تا ئێستاش منداڵێکی شەرمنم ..
هێشتا هەر فێرە قاقا نەبوومە ..
هێشتا دەگریم بۆ کایەکانی منداڵی و
خەون بە سواری ئەسپە قامیشەوە دەبینم ..
خەون بە فرینی کۆلارەیەکەوە دەبینم ..

خەون بە هەموو شتێکەوە دەبینم کە هیچیم نەبووە ..
درۆکانم هەمیشە دەنووسمەوە
تا دوایین درۆم ئاشکرا بکەم بۆ ئێوە ..
من رەنگە مردووەیەک بم .. کە ئارەزووی زیندوو
بوونەوەم نەبێ
رەنگە باشنووسی یاداشتەکانی شێتێک بم
کە زۆر لە من ژیرترە ..
رەنگە خەونی کچە پەرییەکی لادەر بم و
بەر نەفرەتی فریشتەکانی ئاسمان کەوتبم ..
رەنگە هیچیش نەبم ..
من گوڵم پێ نەما بیدەم بە کەس





هەر وەکو چۆن کەس گوڵی پێ نەبوو بمداتێ ..
هەرگیز بەهارم خۆش ناوێت
هەر لە پرسەی من دەچێت و
بە رەشبەڵەک دەست پێدەکات ..
لە گۆرانییەکی سەوزی خنکاو دەچێت
کە هیچ کەسێک تاقەتی وتنەوەی نیە ..
من و ئەم شیعرە ویستمان درۆ راستیەکانی ژیان
بڵێین
بەڵام ژیان
زۆر لەوە درۆترە ببێتە دێڕ و ..
شیعر و .. سرود و .. بەستە ..

له دوکه‌ڵی قومه جگه‌ره‌ی به‌باچووی ده‌می سه‌رخۆشێک
ده‌چێت
که که‌س نازانێ
بۆ ده‌یه‌وێت بیگه‌یه‌نێته ئاسمان ..
ئێمه موڵکی خوداین و ده‌گه‌ڕێینه‌وه بۆ ئه‌و
ئه‌مه ئه‌و دێڕه‌یه که بووه به فه‌لسه‌فه‌ی
دوایین سه‌مای ژیانی هه‌ر که‌سێکمان ..
وه‌کو په‌له‌وه‌ره نه‌خۆشه‌کانی ناو کێڵگه‌یه‌ک
هه‌موومان سه‌ر ده‌بڕن و
قه‌ده‌ری ئه‌جه‌له‌که‌مان وایه ..
کاری من ئه‌وه‌یه به چرای شیعرێک



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

جه‌نگه‌ڵێک بکه‌مه چراخان ..
به‌ڵام لێره شاریش بووه به‌و جه‌نگه‌ڵه‌ی
که هیوای ژیانی تیا نه‌ماوه ..
ده هه‌ستن هه‌موو هاوار بکه‌ن ..
بزانن که‌سێ گوێی له زایه‌ڵه‌تان ده‌بێت؟!
هه‌موو بگرین ..
بزانن که‌سێ فرمێسکتان ده‌بینێ ؟!!
هه‌موو پێبکه‌نن ..
بزانن چه‌ند که‌س به قاقا دێته پیریتانه‌وه !!
ژیان نه گریانه و نه پێکه‌نین ..
نه هاواره‌و نه بێده‌نگی ..

ژیان خۆی هاتووەو لێرە سەرداری رۆح دروست بووە
ژیان مارەی لە کەس نەبڕاوە
کەچی بە مشتێ پوڵی دڕاو
ژیانی هەمومان دەفرۆشن و دەکڕن ..
تف لەو هزرەی دەمانسپێرێ بە گەمژەکان
تف لەو رۆژەی هەموومان دەکوژن و کەسمان
نامرین ..
تف لەو شیعرەی لە سۆزانیەکی بێ پارە دەچێت و
بۆ ئافەرینی ئایدۆلۆژیستە دۆگماکراوەکان دەنووسرێت
..
تف لە ئێمەش کە رازی دەبین ژیانمان





کەمتر بێت لە ژیانی سەگێکی رۆژئاوا
لە ژیانی قەلەمونێکی رۆژئاوا
لە ژیانی مەیمونێکی رۆژئاوا
لە ژیانی پشیلەیەکی رۆژئاوا
تف لە ئێمە و .. لە درۆکانی ژیانمان
تف لەو دێڕانەی کە نازانین بۆ دەینووسین
تف لەو خەیاڵەی پێمان دەڵێت:"ژیان جوانە"
پێمان دەڵێت: ژیان هەناسەو پاکیزەیی ماوە هێشتا
پێمان دەڵێت: دەکرێت ژیان بێ درۆ جوان بێت
ئاخر کە ژیان هەر لەگەڵ درۆدا بگوزەرێ
چۆن بەبێ درۆ جوان دەبێت

ژیان بە درۆوە جوانە ئەزیزم
ئەمە فەلسەفەی بوونی ئێمەیە لەم وڵاتە
ئەمە جوانی ئێمەیە لێرە
کە دەبێ لەگەڵ درۆدا پیاسە بکەین و
لەگەڵ درۆدا دانیشین و
لەگەڵ درۆدا بخۆین و بخۆینەوەو
لەگەڵ درۆدا شەوان ئاوێزانی خەیاڵاتی بەر لەخەو
بین..
لەگەڵ خەودا هەر خەونی درۆ ببینین ..
ماندوو بووم نامەوێ دوایین دێڕ بخوێنمەوە





نامەوێ هیچ کەسێک بیر لە دوادێڕی ئەم قسانە
بکاتەوە
نامەوێ خۆشم بزانم دوادێڕ چیە
نامەوێ گوێ لە گۆرانیەک بگرم
کە کەس نازانێ وشەکانی لە کام دەشت کۆکراوەتەوە
نامەوێ گوێ لە خۆشم بگرم
کە هێندە پڕ ترس و پڕ درۆ چەنەبازی بکەم
کە هێندە بێ ئاگا لە خەوتنی پەپولەکان
بیر لە شکوفتنی گوڵەکان بکەمەوە
کە هێندە بێ ئاگا باس لە درۆبوونی ژیان بکەم ..
نامەوێ ئیدی کەس بڵێت:

تۆ دەتوانی گوڵ بدەی لە یەخەی ژیان
تۆ دەتوانی بە ماچ رەنگی ژیان بکەیتە گوڵ
تۆ دەتوانی لە شێتیدا بیر لە ژیری بکەیتەوە ..
نامەوێ وابزانم ژیان بێ درۆ جوانە ..
نامەوێ چاو دابخەم و هەنگاوەکانم بنێم بەرەو
پەشیمانی
من لەمێژە پەشیمانم لە هەموو شتێك
پەشیمانم لەو ئاوێنەیەی
کە یەکەم جار خۆمم تیا بینی ..
پەشیمانم لەو چاوداخستنانەی کە هەوری لێ وون
دەکردم





کە ئەستێرەی لێ دەشاردمەوە
کە خۆمی لێ پەنهان دەکرم ..
چەند گەمژانە دەمڕوانیە گوڵەکانی باخچەو
شەقامەکانی شار ..
چەند شێتانە ماچم شاباشی دڵتەنگیم دەکرد ..
چاوەڕوانی هاتنەوەی تۆم
درەنگە بۆ هاتنەوە هاوڕێ خێراکە
درەنگە بۆ پیاسە هاوڕێ زووبە
درەنگە بۆ خەوتن هاوڕێ ماتەڵ مەبە
درەنگە بۆ مردن هاوڕێ هەستە لەو مردنە
کە هەر لە ژیان دەچێت و پڕ درۆیە ..

کە هەر لە بوونێکی ئاوی دەچێت و کەس ناتبینێت ..
درەنگە من دۆشداماوم تا گوێم لە یەکەمین هەنگاوت
بێت ..
تا گوێم لە یەکەمین سەلاوی پاش گەڕانەوەت بێت
تۆ پێت ووتم: ژیان لە قولایی خەمەکانی منەوە چرۆ
دەکات
پێت ووتم: ژیان وا لەنێو کتێبخانەی ماڵەکەی مندا
ووتت: من لەگەڵ ژیاندا غار دەدەم و لێم ناباتەوە
کەچی ژیان بە درۆکانیەوە لە ئێمە راستگۆترە
بە خەوتنەکانیەوە لە نەخەوتنەکانی ئێمە بە ئاگاترە
بە دڕکەکانیەوە باخچەکەی لە بەهەشتی ئێمە سەوزترە



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

بە گەردەلولەکانیەوە بیابانەکانی لە مەرگی ئێمە
ئەرخەوانیترە
هاوڕێ دەنگی ئێمە
لە قوڵپە .. قوڵپی گوزەیەکی رژاو بێدەنگترە
گریانی ئێمە لە فرمێسکی رەشەبا وشکترە
پیاسەکانی ئێمە لە وەستانی پەیکەرێك بێ هەنگاوترە
واین لەنێو بازنەیەکداو بەدەوری هیچدا دەخولێینەوە
سەرمان بووە بە تاوێرێك و بارە لە جەستەمان
دڵمان بووە بە قەفەسێکی بێ دەرگاو
هەر عیشقەو خۆی تێ فڕێدەدا
هەر خەمەو خۆی دەئاخنێتە سوچەکانیەوە

هەر جوانیەو یەك .. یەك لەبالْ دەدەن و
جێمان دەهێڵن ..
دەستمان پڕ بووە لە بێ هودەیی
چاومان پڕ بووە لە شۆڕبوونەوە بەرەو خاڵێکی وون
دەممان پڕ .. پڕ بووە لە درۆی راستی و
عەقڵم بە قفڵێکی ژەنگرتوو داخستووە ..
هاوڕێ بگەڕێوە با لەوە زیاتر نەسوتێین لە حەژمەتا
با لەوە زیاتر کەم نەبینەوە
با لەوە زیاتر بەدەست بیر کردنەوەوە گیر نەخۆین ..
تۆ نهێنی تەلیسمی مردنت لایە
وەرە و تەنها جارێك بیخوێنە بەسەرماندا



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

تۆ نەخشەی راکردنت لایە لە راستی
وەرەو بمانگەیەنە بە درۆ
درۆ جوانەکانی ژیان
درۆ پاکەکانی بوون
درۆ چاوکاڵەکانی ئێرە ..
ئێمە تازە ناتوانین لەوە تێبگەین بۆ دەژین
ئێمە هەر دەزانین
شەو بگەیەنینە رۆژ و
رۆژیش ببەخشین بە درۆکانی ژیان
تۆ بەر لەوەی بڕۆی
هێندەی گەورەیی دەریا دڵت گەورە بوو

هێندەی شینایی ئاسمان خەمی ئێمەت بوو
هێندەی گەمژەیی من چاوەکانت بە کلی گریان
دەڕشت
تۆ جوانتری تا پاتۆنیاکانی پێکەنین
تۆ جوانتری تا باخچەکانی ئەو بەهەشتەی لێرەیە و
نایبینین
تۆ گەورەتری تا ئەو کێوانەی
بەشی دەنگی فیشەکێک شۆڕشی تیا نەماوە
ناسکتری لەو گوڵەی بە نیگایەکی درۆزن دەوەرێ ..
ئێمە واین لەنێو ئەو دێڕانەی کە تۆ هێشتا
نەتنووسیون





کە نایانووسی و حەوسەڵەت نیە بیریان لێبکەیتەوە
ئێمە بەر لەوەی تۆ بناسین
خۆمان بەو شەقامانە ناساند
کە تەنها خوێن دەناسن
خۆمان بەو نەسیمە ناساند
کە بیر لە ناسینی هیچ ناکاتەوە ..
خۆمان بە خۆمان نەناساند
تا لە گەلەری هزردا تابلۆیەک بۆ بەدبەختیمان
هەڵواسین
تا لە کۆڵانەکانی ئومێد شەوێک چاوەڕێی هاتنێک
بکەین

ڕۆژێک بەدیار نەهاتنێکەوە بمرین ..
ئای ئێمە چ ئاشنایەکی کەس نەناسین و
چ گەورەیەکی نادیارین و
چ عاقڵێکی هیچ نەدیوین ..
هەر واین بە لێواری نووسینەوە سەما دەکەین و
بیر لە دێڕی تەواو ناکەینەوە
هەر واین لە تەنیشتیماڵەکانی دوێنێوە و
نازانین بەرەو کوێ خەیاڵ بکەین ..
نازانین ڕوو لە کوێ سڵاو ئەدا بکەین ..
کاڵبووینەوە لە عیشق و عیبادەت
کاڵبووینەوە لە زیکرو بەرائەت





کاڵبووینەوە لە خۆمان و ئێستا کەسی دیکەین ..
کاڵبووینەوە .. کاڵ
کاڵبووینەوە لەو گۆرانیانەی کە ئێواران
لەگەڵ قومی جگەرەکانمان بەبامان دەدان ..
کاڵبووینەوە لەوانەی ویستمان تۆخ بین لەگەڵی ..
نە چاوی خۆرمان دەگاتێ و
نە گڕی ئەستێرە .. کەچی هەر لە کاڵبوونەوەداین ..
نە پشتی مێز جێدەهێڵین و
نە لەگەڵ هیچ درەختێکدا ئاوێتە دەبین
کەچی وادەزانین خاکیین ..
نە بیر لە دوێنێ دەکەینەوە و نە ئەمڕۆ

کەچی هەر لە ئێوارەوە دەچینە خەڵوەتی ویساڵەوە
وەسڵی نەزاهەتی عەقیدەو
وەسڵی بەرائەتی حەقیقی ..
هەر لەو بەیانیەوە کە ئەو جێی هێشتین
لەگەڵ گەڵاکانی ئەو پایزەدا کەوتینە وەرین
کە بەر لە تەموز هاتە ئەم مەملەکەتە ..
لەگەڵ ئەو لافاوەدا خنکاین
کە لە گەرمای هاویندا هەموو شتێکی ڕاماڵی ..
لەگەڵ خۆماندا بە تەنیا دەگریاین بۆ کوێرەوەری و
نەهامەتی ئەو قەڵەمانەی کە بە ئێمە سپێرردراوە ..
خەونی وڵاتێک لە نوکەکانیان



عومەر سمیرە
ژیان بە درۆوە جوانە

دەبووە گەردی سەر باڵی ئەو پەپولەیەی
کە منداڵێکی چەتوون باڵەکانی دەوەرێنێ ..
چ حوزەیرانێک و چ تەموزێک بوو ئەم هاوینە
دوانەی دۆزەخێکی زەمینی و
دوانەی گڕکانێکی نەتەقیو بوون ..
هەموومانیان دەبردە لێواری پەشیمانی لە هەناسەدان
دەیانبردینە نزیک خنکان .. نزیک ڕاکردن لە هەموو
شتێک
چ وەرزێکی خۆڵاوی بوو ..
چ وەرزێکی پڕ لە مردن بوو ..
دەمردین و هەناسەمان جێی نەدەهێشتین ..

دەمردین و بۆنی بەهەشتمان پێنەدەگەیشت ..
بەهەشت هەمیشە نامۆیە بە ئێمە
هەمیشە دوورە لێمان
هەمیشە بۆ جارێکیش نایەتە خەومان ..
نایەوێ بچینە لای
نایەوێ بمانبینێ ..
ئای چ سادە دەڕوانینە غروبە دڵتەنگەکان
وادەزانین ئەوە گریانەکانی ئێمەیە
چاوی خۆری پڕ خوێن کردوە ..
چەند بە نەزانی دەچینە لای دار گوڵەبەڕۆژەکان و
نازانین ئەو عیبادەتە لەبەر بکەین





کە ئەو ڕەنگە بیەوێ خۆری پێ بسوتێنێ ..
هیچ لە خۆمان و ئەو هەوایە تێناگەین
کە دەکرێت پێکەوە بچینە ئاسمان و
پێکەوەش بگەینە لای قەرسیلە شێتەکان و
تێکەڵ بین لەگەڵ شەونمەکان ..
ئێمە لەو فەرشە دەچین
کە کەس ناتوانێ بمانتەکێنێ و
دوو گوڵی تۆزلێنیشتوومان بوەرێنێ ..
لەو کورسیانە دەچین
کە قاچێکمان نیە بۆ وەستان و
هەمیشە لەسەرمان دەوەستن ..

لەسەرمان دەخوێنن
لەسەرمان دەنووسن ..
بە درۆ دەچینە لای کانییەکان و
بە درۆ دەگەینە دەم کەل و
بە درۆ ئاسۆ بە وشە راو دەکەین ..
بە درۆ دەبینە شاسواری قارەمانێتیەکان و
دەبینە ئاڵاهەڵگرو
دەچینە بەرزترین لوتکەو
سروودی خاکیی بوونێک دەڵێینەوە
کە چیدی ئێمە نامرین و نابەزین و ناکەوین..
چیدی ئێمە مردووین





ئێمە بەزیوین
ئێمە کەوتووین ..
ئێمە لەگەڵ ئازاری مردن راهاتووین
لەگەڵ چێژی بەزین خۆشە بووین و
لەگەڵ سمکۆڵانەکانی کەوتندا بووین بە هاوڕێ ..
بووین و دەبین بە دیبۆکی ئەو شانۆیەی
کە دەقێکی نیە بۆ نمایش
حیوارێکی نیە بۆ گوێگرتن ..
کەوالیسەکانی خەوتوون و
تاقەتی وەستانیان نیە لەگەڵمان ..
دەبینە گۆدۆو کەس چاوەڕێی هاتنمان ناکات ..

دەبینە رۆمیۆو جۆلێتێك نیە پەلکی بپاچێ
بۆ شەو خەوتنێك لەگەڵمان ..
دەبینە هەموو شتێك و هەر درۆین ..
هەر بە درۆوە جوانین
هەر بە درۆوە ..
دەتوانین جوانمێردی داستانەکانی ئەم سەردەیە بین
هەر بە درۆوە حیکایەتخوانیمان لێدێ ..
چونکە ئێمە بە درۆزنترین مرۆڤەکان دەچین
کە پێدەچێ درۆ لە ئەزەلەوە نرابێت بە نێوچەوانمانەوە
..
درۆ لەگەڵ بوونماندا چەکەرە دەکات





لەگەڵ سێبەرەکانماندا گەورە دەبێت ..
ئێمە هەر چاوەڕێی هاتنەوەی ئەو دەکەین
تا بستێك بمانباتە ئەو دیو درۆوە ..
بمانباتە نزیکی گەواهیەکانی مانگ
لەسەر ناشیرین بوونی تریفەکانی ..
نزیکی دەنگی ناقوسەکانی نەبینین
دەنگی نەورەسەکانی ئاشت بوونەوە
دەنگی پاساریەکانی گوندەکەمان ..
بمانباتە نزیکی خۆمان و هیچی دی نا ..
نزیکی تێگەیشتنەکانی خۆمان و کەسی دی نا ..
نزیکی خۆمان تا لە خۆمان بە ئاگا بێینەوە ..

تا لە تەراتیلەکانی پاکبوونەوە پشکدار بین
تا جارێکی دی
چاوێک بە وێنە هەڵواسراوەکانی خۆماندا بخشێنین و
گەر پێمان کرا
چەند فرمێسکێک بۆ کەمبوونەوەمان رۆکەین ..
گەر ماوە هەبوو
هەندێ بەرەو خۆمان بگەڕێینەوە ..
خۆمان بەر لەوەی خەیاڵەکانیشمان لە عەرەمدا
هەبێت ..
خۆمان ئەو دەمەی کە نەبووین و
لەم بوونە جوانتر بووین ..





کە نەبووین و هەناسەکانمان
لە هەناسەکانی ئەم بوونە خۆشتر بوو ..
ئەو توڕەیە .. نایەوێ بێتەوە
ئەو کە لێرە بوو
ئێمە خۆشمان نەدەویست
ئێمە چەقۆمان بۆ چرۆی ڕوئیاکانی ئەو تیژ دەکرد ..
ئێمە ئەومان سەربڕی
ئێمە ئەومان سڕیەوە ..
ئەو هەر توڕەیە .. توڕە
توڕەیە لەوەی بۆ دەمانەوێ بێتەوە ..
توڕەیە لەوەی .. چیدی درۆ بەسە

خەریکە پەشیمان دەبمەوە
نامەوێ بێتەوە ..
زۆر چاوەڕێم کرد و نەهاتەوە ..
نایاتەوە ئەو ..
ئەو تەواو بوو .. تەواو نایاتەوە ..
ئەو پەیامەکەی خۆی گەیاند و گەڕایەوە
ئەو چیدی کاری لای ئێمە نەما ..
دەبێ بگەڕێین بۆ سکێچە ونەکانی و
لە دیوارە بالاّ بەرزەکاندا هەڵیواسین ..
دەبێ بگەڕێین بۆ فەرمودەکانی و
بە ئاوی هزرێکی تەواو بیشۆینەوە ..





ئەو هەمیشە رۆحێکە یاخی ..
وەکو یەکەمین یاخی بوونی لە رەحمی نەبوون و
هاتنی بۆ بوون ..
وەکو دووەمین یاخی بوونی لێرەو
گەڕانەوەی بەرەو نەبوون ..
وەکو دوایین یاخی بوونی لە هەموو شتێک و
مانەوەی دەنگی و نەمانی رەنگی لێرەو
لە هەموو ئەو هۆلاّنەی کە وەکو هۆڵەکەی ئێمە
چۆلێ .. چۆڵەو تەنها شوێنی لاوک و حەیرانەو
کز .. کز تیای دادەنیشێ و
بۆ گوناحیی ئێمە دەگری ..

بۆ نەزانی ئێمە شیوەنێک ساز دەکات ..
بۆ نەگەڕانی ئێمە مەراسیمێکی پڕ شکۆ ڕێک دەخات ..
ئەو ئێستا لەناومانەو
گوێی لە هەموو وشەکانمانە ..
بێزار بووە .. تەواو نایەوێ شتی دیکە بڵێت ..
ئەو دوایین دێڕ لە بری من دەنووسێتەوەو
پێم دەڵێت: پێیان بڵێ: چاوەڕێی چیتر دەکەن ..!!؟
دەڵێت: مەوەستە
گەر کەسێک نەبوو وەلامت باتەوە
بڵێ: کۆتایی و دوو خاڵ دانێ ..
کۆتایی و دوو خاڵ ..



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

دەڵێت: بوەستە
تەواوی مەکە .. دەشێ شتێکی دیکەش بڵێی
گوێ ڕادەدێرم کەسێک هیچ ناڵێت ..
کەس تەماشای بۆردی گلەییەکان ناکات
کەس حەوسەڵەی نیە بیانخوێنێتەوە ..
کەس قەڵەمی پێ نیە
کەس هیچ ناڵێ .. کەس
هەر بیر دەکەمەوە شتێک نەماوە ..
ئەو دەڵێت:بفڕە بۆ ژێرزەمینەکانی خەیاڵ
بزانە لەوێندەر
شتێک هەیە بۆ ووتن ..!!

لەسەر لقی ئاسمانەکان بنیشەرەوە
ئەستێرەیەکیان ماوە ورشەدار بێت ..!!
لەسەر زەمینەکان هەرگیز مەسرەوە
سەرزەمینەکان بۆگەنیان کردوە ..
بە کورسی هەرگیز رازی مەبە ..
لە پشت مێزەوە دامەنیشە
پشت مێزەکان پڕن لە شەهوەتی ناپیاوی
پڕن لە قەڵەمی راپۆرت و
پڕن لە ئینجانەکانی دڕك ..
دەڵێت:
دەتوانی بچیتە ئەوێ





لای دارگوێزەکانی نیشتمان و
لای هەنارە گێلەکانی روانین
تا لەو نسارانەی کاروانیەکانی تیا دەمرن
بۆ پەژموردەیی رۆح
بەیتەکانی ئاو بڵێتەوەو
گوێ بۆ درۆکانی دارستان رادێری ..
دەتوانی هەڵبێی بۆ ئەوێ
لای کەنارەکانی مردن و
لای لاسکە گیایەکی شەرمن ئۆقرە بگری
تا لە سەرخەوەکانی منداڵی
بیر لە هاتنەوەی شەڕەبەردەکانی کۆڵان و

موشێنەکانی گەرەکی ئەودیو بکەیتەوە ..
بۆ گەڕانەوەی نیگایەکی منداڵانە
بۆ ئەو بنمیچانەی
کە هەرگیز
دەستێک نیە ماڵی جاڵجاڵۆکەکانی تێک بدات ..
بۆ گەڕانەوەی تامی تەنها قومێک
لەو ئاوەی کە پاش ڕاوڕاوکێکان دەخورایەوە ..
بۆ گەڕانەوەی ئەو ئومێدەی
کە بۆ هاتنی بەهارەکان دەهاتە دڵمانەوە ..
بەردەوام دەڵێت:
خەنجەرەکان تۆڵی پشتوێنەکانیان جێهێشتووە





لەنێو شەقامەکاندا بۆ ئازایەتی مەگەڕێ ..
پەڕندەکان درەختەکانیان چۆڵ کرد
چاوەڕوانی شەقژنی نیوەشەوانیان مەکە ..
گورگەکان چاویان تیژە
قەڵەمەکانتان تیژتر نەکەن دەخورێن ..
ڕووبارەکان سەریان هەڵگرتووە
لێبوونەتەوە لە گەڕان بەو هەموو شیوو دۆڵانەدا
کە هەموو سەرکێشانێکی بە کەنارەکاندا
بێ هورەبوو .. بێ هورە ..
دەریاکان دزران .. ئۆقیانووسەکان کۆسیان کەوت
هەورەکان ئیغتیساب کران

شاخەکان پێچرانەوەو
کران بە قورگی سوڵتانەکانەوە ..
شەوو ڕۆژەکان لەیەک مارە کران و
لە کەژاوەی جەللادیدا
هەموو ڕۆژێک هەزاران مردن دەهێننە بوونەوە
هەزاران ڕۆح شاباشی سەرکەوتنەکانیان دەکەن
هەزاران کچێنی دیوار ئەتک دەکەن ..
درۆ دوا دروشمی گوڵدانەکانە
درۆ دوا وێستگەی سەفەرە ناوەختەکانە
درۆ دوا تەهلیلەی دەروێشە گێلەکانی سیاسەتە
درۆ دوا ماچی عاشقە درۆزنەکانی نیشتمانە



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

درۆ دوا دێڕی هەموو ڕۆمانەکانە
دوا دێڕی هەموو داستانەکانە ..
لە نووسینێکدا نووسیبووی:
کە دەمرم هەموو ڕۆژێکم هاتنەوەیە بۆ لاتان
هەموو ساتێک لەلاتانم
هەموو کۆڕێک لەگەڵتانم ..
دە پێم بڵێن .. کەسێک هەیە بیبینێ لێرە ..؟
کەسێک هەیە وەکو من گوێی لە دەنگی بێت
کەس ئەو دەناسێت
کەس دەزانێت لە کوێوە دانیشتووە ..؟
شێتییە چاوەڕوانی ئەو

گێلێتیە کاڵکردنەوەی کات
لە ئینتیزاری هاتنی ئەو ..
مردنە بینینی ئەو
نەمانە گەیشتن بە ئەو ..
کێ دەتوانێ
پەلکی قەسیدەیەکی ئەو بدۆزێتەوە
لەنێو ئەو دێڕانەی کە هەر دەیڵێم و
دەیڵێم و هیچی لێتێناگەم ..
کێ دەتوانێ بگەڕێتەوە ئێرەو
لێرەوە خاڵێکی کۆتایی
بۆ سەرەتاکان دابنێت ..





کێ دەزانێ بنووسێت
با لەگەڵ درۆکانی ئەودا
پێکێک بە خۆشی مەرگی ئەمڕۆمانەوە فڕ بکات
بەتریقانەوەوە باسی پەشیمانیەکانمان بگێڕێتەوە
پێدەچێ کەس لەو ئایەتە تێنەگات
کە بۆ هەمووومان دابەزیوەو
باسی بێ ئاگایی دەکات ..
باسی خەوتن دەکات لە کوچەکانی نەزانین
باسی هیچیش دەکات ..
باسی هیچبوونەوە دەکات لە هەموو شتێکدا ..
کەس سەوادی ئەوەی نیە

که دوو دێری شێتێک
له دێرەکانی منالی جوێ بکاتەوە ..
کەس سەودای ئەوەی نیە
که گۆرانی پەپولەکان
له هەنسکی گوڵێک جوێ بکاتەوە ..
کەس لەوە تێناگات
ئەو هەموو خەونە ڕەنگالانەی منالێک
بەرەو کوێ دەبرێو
سەر بە چ وێرانەیەکدا دەکات و
لەژێر داروپەردووی کوێی تەمەندا وون دەبێت ..
تەمەن پڕە له درۆکانی بوون



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

پڕە له گوناهەکانی ئەمڕۆ
ئەو گوناهانەی
له تەنیشت لێژبوونەوەی ساڵەکاندا گەورەبوون
لەگەڵ مەستیی خەمەکاندا پیر دەبوون ..
ئەمڕۆ لەو چیرۆکە تێدەگەم
که یەکەمین ڕۆژی بوونم
له بری کتێبی پیرۆز نرایە ژێر سەرینەکەم ..
لەژێر سەرینەکەمدا .. لەگەڵ گەورەبوونمدا
گەورە دەبوو ..
ئەمڕۆ دەزانم چیری مەتەڵێکم نەماوە بۆ ژیان
مەتەڵێکم نەماوە بۆ شەوان

مەتەڵەکانیش پیر بوون و بەسەرچوون
مەتەڵەکانیش هەموو درۆ بوون ..
لەگەڵ یەکەمین پروشەی بارانی
ئەو پاییزەی چاوەڕێمەو چاوەڕێیم
دوایین دێڕی ئەم قەسیدەیە دێتە بوون
دوایین دێڕی ئەو قسانەی
کە نەدەبوو بوترێن دەنووسرێن ..
لەگەڵ یەکەمین کلوەبەفری
ئەو زستانەی دێت و پەنجەکانمان دەسوتێنێ
دوایین حیکایەتی وڕبوون تەواو دەبێ و
یەکەمین تەقواکانی گەورەبوون





دەست پێدەکەین ..
ئەو تەقوایانەی
کە دەکرێت وەکو ئێستا پڕ درۆبن
وەکو دوێنێ خاڵی لە مەعریفە
وەکو سبەی کاڵ لە هەموو پیرۆزییەک ..
درۆیە ڕاکردن لە بیابان
درۆیە گەڕان بە شوێن هەنگاوەکانی منداڵی
درۆیە گەورەبوون
درۆیە نوێژەکانی گەورەیی
درۆیە فەنتازیاکانی قەڵەم
درۆیە .. هەموو شتێک درۆیە

ژیان شەبقەی خەمی لەسەرەو
بە گریانەوە دەچێتەوە لای پۆلەکانی عاشقبوون
ژیان گریانەکانی منالی ئەرشیف کردووەو
باس لە زەردەخەنەکانی هەرزەیی دەکات ..
ژیان هەمیشە نامەکانی ئێستا
بە نووکی پێلاوەکانی دەکاتەوە
هەر وەکو چۆن من بە پەنجەکانی پێم
نامەکانی دوێنێم دەنووسی ..
ژیان رۆژ نیە درۆکانی دووبارە نەکاتەوە
کەچی رقیشی لە درۆیە
ژیان لە ئێمەدا هەر درۆیە ..



عومەر سەیدە
ژیان بە درۆوە جوانە

ئەوە تارماییەکەی گەیشت
ئا ئەوە ..(ئەو)ە ..
ئەو دەڵێت:
بیرت نەچێت کە بڵێی:
گەر ئێوەش وەکو من
ئەم هەموو درۆ جوانانە دەبینن
ئەم هەموو هۆنینەوەی درۆیە دەبینن
ئەم هەموو دێڕە بێ تامانە دەبینن
ئەم هەموو فۆرمە لاوازانە دەبینن
ئەم ناوەڕۆکە پڕ درۆیە دەبینن ..
دە ئیمان بهێنن

بە تەفسیرێک بۆ ئەو خەیاڵەی کە دەڵێت:
ژیان بە درۆوە جوانە و
بڵێین: شایەری دەدەین کە
ئەوان .. ژیان بە درۆوە
ئێمە .. ژیاین بە درۆوە
ئەو .. ژیا بە درۆوە
لەم وڵاتەدا .. ژیان بە درۆوە جوانە ..

حوزەیران و تەموزی ٢٠٠٥

شیعر

# ژیان

# بەدرۆوە جوانە

عومەر سەیدە